

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **کتێبخانە گشتییەکان**

- **د. محەمەد فەتحی عەبدولهادی ـ د. نەبیلە خەلیفە جومعە**
- **وەرگێڕانی: یاسین قادر بەرزنجی**
- **نەخشەسازی ناوەوە: مەهدی ئەحمەد قادر**
- **بەرگ: ڕێمان**
- **تایپ و هەڵەبڕی: بەیان عەلی محەمەد**
- **نرخ:** ٢٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم:** ٢٠١٣
- **تیراژ:** ٧٥٠ دانە
- **چاپخانەی: موکریانی (هەولێر)**
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (١٧٦٧) ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧٥٨)**

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێڕست

## پێشەکی

لە ئەنجامی کارکردنی دەیان ساڵەم لە بواری کتێبخانەی گشتیدا ئـەو راسـتیەم لا چەسپیوە کە نەبوون، یـان کـەمیی سەرچـاوە زانسـتییەکان لـە بـواری (کتیبخانـەو زانیارییەکاندا) بە زمانی کوردی کاری نـەرێنی کردوەتـە سـەر خزمەتگوزارییـەکانی کتێبخانەکانو کتێبخانە گشتییەکان بە شێوەیەکی تایبەت لـە شـارو شارۆچـکەکانی کوردستانداو پراکتیزە نەکردنی چەمکە زانستییەکان لە کاری رۆژانەی کتێبخانەکاندا جۆرە پاشاگەردانییەکی هێناوەتەوە ئاراوەو ئەمەش بووەتە یـەکێك لـە فاکتـەرەکانی قەیرانی نەخوێندنەوە لە وڵاتەکەماندا.

لەبەر رۆشنایی ئەو بۆچوونەدا ساڵانێکە وەك ئەرکێکی سەرەکیی خۆم بە پێویستم زانیوە چەندین کتێب بۆ ئـەم بـوارە گرنگـە بنووسـمو وەربگێـڕم، کـە ئـەم کتێبـەی بەردەستت دواهەمینیانە، بەو هیوایەی رۆڵێکی ئـەرێنی ببینـێ لـە بەزانسـتیکردنی میتـۆدی کـاری کتێبخانەییـداو ببێتـەی مایـەی سـوودبینیی کارمەنـدی کتێبخانـە گشتییەکان. بەلای منیشەوە، بۆ ئێمەی خاوەن ئەزموونی کەم لە بواری ئەم زانستەدا، (زانستی کتێبخانەو زانیارییەکان)، وەرگێڕانی سەرچاوەکان بە زمانانی تر ( بێگومان لە پێشەوەیاندا زمانی عەرەبی) کارێکی پەسەندە، چونکە لـە کتێبخانـەی کوردیـدا خاوەنی ژمارەیەکی کەمین لە توێژینەوە زانستییەکان بە زمانی خۆمان، کە بنە ژێدەر بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە زانستییەکان.

نووسەرانی ئەم کتێبە، کە دوو مامۆستای پسـپۆڕی بەشـی زانسـتی کتێبخانـەو زانیارییەکانی زانکۆی قاهیرەن، لە هەشـت بەشـدا کتێبەکـەیان بـەئاکام گەیانـدووە،

لەبەشی  یەکەمدا پێناسەو پەیامی کتێبخانــەی گشــتیو ئامانجــەکانی، کتێبخانــەی گشتیی لەنێو جۆرکانی کتێبخانەدا، شێوەی کتێبخانەکان، باسکراون.

لە بەشی دووەمدا تەلاری کتێبخانەی گشتی تیشــکی خراوەتــە ســەر  لــە ڕووی: جێگــا، نەخشەســازییو نەخشەســازیی نــاوەوەی، پاراســتنی کتێبخانــە، کەرەســتەو کەلوپەلەکان.

بەڵام بەشــی ســێیەم تەرخانــە بــۆ لایەنــەکانی ڕێکخســتنو کــارگێڕیی کتێبخانــە گشتییەکان.

بەشی چوارەمی کتێبەکەش تایبەتە بە کارە هونەرییەکان لەکتێبخانەدا.

هەر لە هەڵبژاردنی  سەرچاوەکانەوە بــۆ پێڕســتو پــۆلێن تــا دەگــات بــە بــەرگ تێگرتن.

لە بەشی پێنجەمدا خزمەتگوزارییەکانی کتێبخانەی گشتیی راڤــەکراوە لــە ڕووی خواســتن، خزمــەتگوزاریی ژێــدەرو زانیارییــەکانو سەرچــاوە بیســتراوو بینراوەکــانو خزمەتگوزاریی گروپی دیاریکراو لەسوودمەندان.

دوا بەشی ئەم کتێبەش تایبەتە بە باسەکانی خزمەتگوزاریو چــالاکییەکانی تــری کتێبخانە وەکــو لێــدوانی کتێبخانــە، کۆمەڵــەی هاوڕێیــانی کتێبخانــە، برەوپێــدانی خزمەتگوزارییەکانو بانگەشەو ئاگاداری.

بەڵام ئەو دووبەشەی کۆتایی کتێبەکە، کە بریتیین لە (بەکارهێنانی تەکنــەلۆجیای زانیارییەکانو کتێبخانە گشتییەکانی میسر)، و تەرخانە بۆ ئەو دوو باسە بە تایبــەت لەو وڵاتەدا. هەر بۆیە نەخرانە ناو وەرگێڕانەکەی ئێمەوەو بەهیوام لــە دەرفــەتی تــردا بێمەوە سەریان.

سەرچاوەی وەرگێڕانەکەی ئێمە چاپی دووەمی ئەو کتێبە عەرەبییە یە (المكتبات العامة) کە لە ئۆکتۆبەری ٢٠١٠دا لەلایەن (الدار المصرية اللبنانية)ەوە لەچاپدراوە.

مایەوە بڵێم، لە زۆربەی کاری وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا هەموو دەقە ئەسڵییەکە کراونەتە کوردی، بەڵام لە هەندێ جێگادا، کە هەست بە پەرەگرافو شیکردنەوەی زیاد لە پێویست کرابێت، کە خوێنەر یان کارمەندی کتێبخانەکان پێویستیان پێی نابێ، کردەی کورتکردنەوەیان لەگەڵدا کراوە.

هیوادارم بەم کارە خزمەتێك بە کتێبخانەکانو مامۆستاو خوێندکارانی بوارەکە بگەێنم.

**یاسین قادر بەرزنجی**
**٢٠١٣/٨/١٧**

**١-پێناسە:**

گەلێك پێناسە بۆ كتێبخانە گشتییەكان كراوە، لەوانە "كتێبخانەی گشتی دامەزراوێكی دەسەڵاتی خۆجێ ییە، بەمەبەستی پێشكەش كردنی سەرچاوەو خزمەتگوزارییەكان بۆ هەموو دانیشتووانی ئەو ناوچەیە".

بەشێوەیەكی گشتی، ئەم جۆرە كتێبخانەیە دامەزراوێكی رۆشنبیرییەو خزمەتگوزارییە كتێبخانەییو زانیارییەكانی پێشكەش بەتاكەكانی كۆمەڵگا لەناوچەیەكی دیاریكراودا دەكاتو كۆمەكی گشتیو تایبەتی پێدەبەخشرێت.

ئەم پێناسەیە ئاماژەن بۆ چوار بنەمای بنچینەیی:

أ-كتێبخانەی گشتی خزمەتگوزارییەكانی خۆی پێشكەش بەهەموو توێژەكانی كۆمەڵگا دەكات بەبێ جیاوازیی رەگەز یان ئایین یان رەنگو..تاد، هەرچۆن خزمەتی هەموو تەمەنێكی منداڵو گەنجو ئاستی رۆشنبیریو خوێندن دەگرێتەوە.

ب-بەشێوەیەكی گشتی، ئەم جۆرە كتێبخانەیە خزمەتگوزارییەكانی بێبەرامبەرە.

ج-كتێبخانەی گشتی دەبەسرێتەوە بەو شوێنەی تیایدایە، ئیتر شار بێت یان پارێزگا، یاخود شارۆچكەو گوندو گەڕەكێك، ئەمەش دەخوازێت لەكتێبخانەكاندا سەرجەم سەرچاوەكانی زانیاریی مرۆیی لەبەردەستدابن، لەگەڵ رەچاوكردنی ئەو ژینگەیەی كە كتێبخانەكەی تیادا دەبێت، وەكو كشتوكاڵی یان پیشەسازیی..تاد.

د-كتێبخانەی گشتی ئەو شوێنەیە كە خەڵكی بەئارەزووی خۆیان رووی تێدەكەن.

**٢-ئامانجی كتێبخانە گشتییەكانو ئەركەكانیان:**

كتێبخانەی گشتی، هەوڵدەدات بۆ هێنانەدیی چەند ئامانجێك، ئەوانیش:

أ-رۆشنبیرکردن: واتە دەستەبەرکردنی سەرچاوەو پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بۆ سوودمەند کەببێتە هۆکاری گەشەکردنی چێژی هونەریو ستاتیکییان، ئەمە بێجگە لە گونجاندنی لەگەڵ ئەو کۆمەڵگایەی تیایدا دەژی، وێڕای ئەوەی کە کتێبخانەی گشتی یەکێکە لە ناوەندە سەرەکییەکانی ژیانی رۆشنبیری.

ب-راگەیاندن: واتە گەیاندنی زانیاریی ورد بە تاكو گروپ" بەتایبەت لەو بابەتانەدا کە جێبایەخی گشتین، تاوەکو ئاگاداربن لەو رووداوانەی لەسەر ئاستی ناوچەییو نەتەوەییو جیهانی روودەدەن.

ج-فێرکردن: واتە هاندانی گەورەو منداڵ بۆ خۆفێرکردن، ئەوانەی لە خوێندندا گەیشتوونەتە قۆناغێكو مەبەستیانە سەرچاوەی خوێندنەوەی پێویستیان دەستبکەوێتو ئاستی خۆیان پێشبخەن.

د-سوودوەرگرتن: واتە سوودوەرگرتن لە کاتە زیادەکانو خوێندنەوە تیایاندا.

د.حشمت قاسم زیاد لەو ئامانجانە، ئاماژە بەرۆڵی کتێبخانە دەکات لە خزمەتی توێژینەوەی زانستیو بڕیارداندا، هەروەها لەڕێنمایی بۆ پرسو پڕۆژەو ئەو لایانانەی جێبایەخی تایبەتی کۆمەڵگان، ئەمانە بێجگە لە کۆکردنەوەی دۆکیۆمێنتەکانی کۆمەڵگاو رێکخستنیانو پاراستنیان.

گەلێك لەوڵاتانی جیهان، لەرێی کۆمەڵەی کتێبخانەکانیان، یان لەرێی ئەنجومەنی نیشتمانیی کتێبخانەو زانیارییەکان، مەبەستیانە کە زانیارییەکانی (statements)ی پەیوەست بەئامانجی کتێبخانە گشتییەکانیان بلاوبکەنەوە، لەگەڵ پێداچوونەوەو تازەکردنەوەیان بەشێوەیەکی رێکوپێك.

راگەیەندراوی فەرمیی کتێبخانە گشتییەکان لە(یۆنسکۆ)وە ئەمانەی تیادا هاتووە:

١-درووستكردنو بەهێزكردنی ئارەزووی خوێندنەوە لای منداڵ لە قۆناغە سەرەتاییەكانی تەمەنەوە.

٢-پشتگیریی لە فێركردنی خودیو تاكەكەسی لەپاڵ خوێندنی فەرمی لە هەموو ئاستەكاندا.

٣-پێشكەشكردنی هەلی گەشەی تاكەكەسیی ئەفراندن.

٤-هاندانی ئەندێشەو داهێنان لەلای منداڵو گەنجان.

٥-نرخاندنی هونەرەكانو ناسینی كلتوری رۆشنبیریو داهێنانە زانستییەكان.

٦-هاندانی دیالۆژ لەنێوان كلتورەكانداو پشتگیری لە هەمەجۆری كلتوریو ئیتنیكی.

٧-پشتیوانی لەكلتوری زارەكی.

٨-جەخت لە گەیشتنی سەرجەم هاوولاتیان بەهەموو جۆرەكانی زانیارییە كۆمەڵایە تییەكان.

٩-پێشكەشكردنی خزمەتگوزاریی زانیارییەكان بۆ هەموو پرۆژەو كۆمەڵەو گروپی ناوچەیی.

١٠-گەشەپێدانی توانای قەلاچۆی نەخوێندەواریو بەشداریی لە چالاكییەكاندا بۆ ئەو مەبەستە.

زۆربەی راگەێندراوە نوێیەكان باسی كتێبخانەی گشتی دەكەن كە بەشێوەیەكی سەرەكی بەشدارە لە قوولكردنەوەی دیموكراسیو مافی هاوولاتیبووندا، هەرچۆن رۆڵی كارای هەیە لەنەهێشتنی نەخوێندەواریو بەرزكردنەوەی بەرهەمدا.

بەو پێیە، کتێبخانەی گشتی دامەزراوێکی رۆشنبیریی کۆمەڵایـەتیی تەواوکـەری خوێندنە و رۆڵێکی گەورەی هەیە لـە خزمـەتکردنی کۆمـەڵگادا، تەنانـەت هەنـدێك بەسەنتەری زانیارییەکانی کۆمەڵگای ناودێر دەکـەن، چـونکە بەشـدارە لـە پرۆسـەی پـەروەردەو فێرکردنـی بـەردەوامو یارمـەتیی منـداڵ دەدات بـۆ پـەروەردەبوونی کۆمەڵایەتییان بەشێوەیەکی راستو دروست، هەرچۆن هاوکارە لەپێکهاتەی سیاسـیو رۆشنبیریی هاوولاتیاندا، ئەمە بێجگە لەوەی کاردەکات بۆ دەرخستنی کلتورو بـەهاو دابونەریتی کۆمەڵگای خۆجیێ یەتی.

ئێستا لەسەر ئاستی جیهان کۆشش دەکرێت بۆ نوێکردنەوەی کتێبخانـەی گشـتی تـاوەکو داخـوازیی کۆمـەڵگای زانیاریـیـەکانو کۆمـەڵگای سـەدەی بیسـتویەکەم بهێنێتەدی، لەوانەش پرۆژەی ئەنجومەنی ئەوروپای تایبەت بەکتێبخانـە گشـتییەکانو کۆمەڵگای زانیارییەکان لەولاتانی ئەوروپادا.

دیدی ئەوروپی بریتییە لە: کتێبخانەی گشتی پارێزگار لە نوێبوونەوەی لەسـەرجەم کۆمەڵگای ئەوروپادا، بۆ گەیشتن بە:

*تۆماری مرۆیی پارێزراو و هەڵگیراو بەهەر شێوەیەك بن.

*خواستن بەرێگا جیاوازەکان.

*تۆرِو کۆمەکی هونەری بۆ گەرانو دۆزینەوە.

*هەلی مەشقو فێربوونی کراوە.

*جێگایەکی ماددی کە ئەفراندنی مەعریفی پێشکەش بکات.

*گەیشتن بە هەموو خزمەتگوزارییە زانیارییەکان.

*خزمەتگوزاریی وەرگرتنی دۆکۆمێنتە ئەلیکترۆنییەکان، پێویستە کتێبخانە گشتییەکان کە ئەو هەموو خزمەتگوزارییە پێشکەش دەکەن بەشێك بن لە تۆڕەکانی کتێبخانەی تر بەفراوانی، هەرچۆن دەبێت هاریکاریی لەگەڵ خوێندنگاو کۆلیجەکانو دامەزراوی تر بکەن.

ستراتیجی پێویست ئەوەیە کە کتێبخانە بگاتە سەرچاوە چاپکراوەکان، لەگەڵ سەرچاوە ئەلیکترۆنییەکان، هەروەها پێویستە سوودمەندان رابهێنێت بۆ بەکارهێنانی سەرچاوەکان، بۆماوەی دووریش کتێبخانەی گشتی دەبێ بەرهەمهێنێبێتو زانیارییەکان بلاّوبکاتەوە.

لەلایەکی ترەوە، کتێبخانەی گشتی روویەکی ستراتیجی هەیە کە پەیوەستە بەخزمەتگوزارییەکانیەوە، ئەویش لە چوار رووەوەیە:

-مەڵبەندی رۆشنبیرییە.

-کتێبخانەی فێربوونو فێرکردنە.

-سەنتەری زانیاریی گشتییە.

-مەڵبەندێکی کۆمەلاّیەتیی بەنرخە.

لەلایەکی تریشەوە، تێڕوانینێکی ئەمریکی هەیە بۆ پەیوەندیی کتێبخانەی گشتی بەئینتەرنێتو بونیادی زانیاریی نیشتمانییەوە:

*سەنتەرێکی تۆڕئاسای نەهێشتنی نەخوێندەوارییە، مەشقو فێرکردنی کۆمەڵی لەئەستۆدایە بۆ چۆنێتی فێربوونی ئینتەرنێتو پەیداکردنی سەرچاوەکانی زانیاریی ئەلیکترۆنی.

*سـەنتەرێکی گـەردوونی زانیارییـە ئەلیکترۆنییەکانـەو لـەکاتی پێویسـتدا خزمـەتگوزاریی خـۆی پێشـکەش بەئەنـدامانی کۆمـەڵگا دەکـات، ئـەویش لـەرێی تۆڕەکانی زانیاریی جیهانییەوە.

*پەیوەندیی بەزانیارییە حکومییەکانەوە هەیە بەمەبەستی گەیشتن بـە زانیارییـە ئەلیکترۆنییە ناوچەیی‌و ویلایەتی‌و فیدراڵییەکان.

*ناوەنـدێکی ئەلیکترۆنییـەو بەدرێـژایی ژیـان هـەلی فێرکردنـی کۆمـەڵگا دەڕەخسێنێت.

*سەنتەرێکە بۆ سوودی هەمووان.

*سەنتەرێکی ئابوورییە، کتێبخانەی گشتی زانیاریی سەبارەت پلەی کارو پـڕۆژە بچـووکەکان رادەگـەێنێت‌و هـانی بەشـداریی نێـوان خزمەتگوزارییـە ناوچـەیی‌و کۆمەڵگاییەکان دەڕەخسێنێت.

ئێسـتا کتێبخانـە گشـتییەکان لـە وڵاتـە یەکگرتووەکانـدا سەرپەرشـتی تـۆڕە بێ‌بەرامبەرەکان دەکەن، بـۆ سـوودی ئەوانـەی لـەڕووی داراییـەوە لەتوانایانـدا نییـە سەرچـاوە زانیارییـە ئەلیکترۆنییـەکان لـەرێی تۆڕەکـان‌و بەتایبـەت ئینتـەرنێت بەکاربهێنن.

بەرپرسیاریی کتێبخانەی گشتی لە ئەستۆی دەسەڵاتە ناوچەیی‌و نەتەوەییەکاندایە، پێویستە لەرێی یاسای دیاریکراوەوە پشتگیریی لێ بکرێت، هەروەها دەبێـت لەلایـەن حکومەتە نەتەوەیی‌و ناوچەییەکانەوە کۆمەکی ماددیی بکرێت، بەوشێوەیەش دەبێتـە پێکهاتەیـەکی سـەرەکیی لـە سـتراتیجی درێژخایـەن بـۆ رۆشـنبیری‌و لـەناوبردنی نەخوێندەواری‌و فێرکردندا.

بۆ ئەوەی کتێبخانـەی گشـتی ئامانجـەکانی بهێنێتـە دیو رۆڵـی خـۆی بەباشـی ببینێت، پێویسـتە سەرچـاوەکانی زانیـاریی بەهـەر شـێوەیەك بـن دابینیـان بکـات، پاشـانیش کاربکـات بـۆ ڕێکخسـتنیانو ئامـادەکردنی کەرەسـتەکانی هێنانـەوە بەردەستیان بەهۆی تازەترین تەکنیکـە گونجاوەکانـەوە، هەرچـۆن پێویسـتە چـالاکیی جۆراوجۆری دیکەش بنوێنێت، هاوکات بازنەی خزمەتگوزارییـەکانی فـراوان بکـاتو هەموو وڵات بگرێتەوە، پێویستە بۆ پەیوەندیی گشـتی خـاوەن بەرنامـەی کارابێـتو بەشداریی سـەنتەرو دامـەزراوە رۆشـنبیرییەکانی تـر، بەمەبەسـتی پێشکەشـکردنی خزمەتگوزاریی تەواو بۆ کۆمەڵگا بکات.

### ٣-کتێبخانە گشتییەکان لەنێو جۆرەکانی کتێبخانەکاندا:

دامەزراوی کتێبخانەو زانیارییەکان بەسەر سێبەشی سەرەکیدا دابەشدەبن:

أ-دامەزراوە مەیدانییەکان، ئەوانەن کە کارکردنیان لەبواری پسپۆڕیدایە، ئیتر لـە ڕێکخستنی سەرچاوەی زانیارییەکاندا بێت، یان خستنەبەردەستیان لـەپێناوی سـوودی گشتیدا.

بەشی یەکەمی ئەم دامەزراوە بە (ڕێکخسـتنی بیبلیـۆگرافی ناودەبرێـتو بەشـی دووەمیشـی بـە دامـەزراوی دابینکـردنو بـەکارهێنان)، کـە کتێبخانـەو سـەنتەری زانیارییەکان بەهەموو جۆرەکانیانەوە لەخۆدەگرێت.

ب-دامەزراوە ئەکادیمییەکان، کە بایەخ دەدات بە ئامادەکردنو راهێنانی پسپۆڕی پێویست بەمەبەستی کارکردنیان لـە کتێبخانـەو سـەنتەرەکانی زانیاریـدا، هەرچـۆن تایبەتمەندە بە ئەنجامدانی توێژینەوە لە بوارەکانی کتێبخانەو زانیارییەکاندا.

ج-دامەزراوە پیشەییەکان، ئەوانەن کە سەرجەم پسپۆڕانی کتێبخانەو زانیارییەکان کۆدەکەنەوەو بەرپرسن لە ماف‌و ئەرکەکانیان، ئەمانەش هەمیشە لەشێوەی کۆمەڵـەو ڕێکخراوی پیشەییدا دەبن.

کاری کتێبخانە گشتییەکان لە لوتکەی دەسەڵاتی باڵای زانیـاری‌و کتێبخانـە لـە وڵاتدا، ئیتر ناویان هەرچییەك بێت، بەرپرسن لە پلاندانان‌و ڕێکخسـتن‌و سەرپەرشـتیی کتێبخانەو سەنتەری زانیارییەکان بەهەموو جۆرەکانیانەوە.

کتێبخانەی سەروو هەموو کتێبخانەکان لەوڵاتدا (کتێبخانـەی نیشـتمانی)یە کـە بەکتێبخانەی دەوڵەت دەناسرێت، کە بەرپرسە لە دابینکـردن و پاراسـتنی بەرهـەمی هزریی نیشتمانی یە و سەرچاوە گرنگە جیهانییـەکان، ئـەم کتێبخانەیـە بڵاوکـراوەی بیبلیۆگرافی دەردەکات‌و لەهەر وڵاتێکدا یـەك کتێبخانـەی نیشـتمانی هەیـە، بـەڵام هەندێ کتێبخانەی تر لە پسـپۆڕیی تایبەتـدا بەشـداریی دەکـەن، وەکـو کتێبخانـەی نەتەوەیی بۆ پزیشکی، یان کشتوکاڵی.

دوای ئەوانیش کتێبخانەی تایبەتمەند دێت کە بەرپرسە لەو سەرچاوانەی سـەبارەت بابەتێکی دیاریکراون لە بوارەکانی زانیاریی مرۆییدا.

بەڵام کتێبخانەی زانکۆو پەیمانگاکان لە خزمەتی دامەزراوەکانی خوێندنی باڵادان، ئیتر زانکۆ بن یان کۆلیج یان پەیمانگا، ئەوان سەرچاوەی ئەوتۆ دابین دەکەن کە تایبەتن بەخوێندنیان‌و توێژینەوەی زانستی خوێندکاران‌و دەستەی مامۆستایان.

کتێبخانەی خوێنـدنگاکانیش لـەپێناوی منـداڵی باخچـەی سـاوایان تـا دەگـات بەخوێندکارانی قۆناغی ئامادەیی دەکرێنـەوە، لەگـەڵ سەرچـاوەی تـر کـە خزمـەتی چالاکییەکانی خوێندکارو مامۆستایان‌و کارمەندان بکەن.

کتێبخانەی گشتی پەیوەندی توندوتۆڵی هەیە بـە کتێبخانـەکانی تـرەوە، چـونکە لەسەرەتادا هەر ئـەم کتێبخانەیـە ڕۆڵـی کتێبخانـەی نیشـتمانیی دیـوە، بـۆ نموونـە کتێبخانەی (خدیوی) لە میسر هەر لـە دامەزراندنیـەوە ڕۆڵـی هـەردوو کتێبخانـەی گشتیو نیشتمانیشی بینیوە.

هەرچۆن بەشداریی کتێبخانەی تایبەتمەندیش دەکات لە هەنـدێ چـالاکیدا، بـەڵام کتێبخانەیەك کە زۆرترین پەیوەندیی هەبێت بە کتێبخانەی گشتییەوە ئەوا کتێبخانەی خوێندنگاکانە، چونکە دەبێتە پەیوەندیـداری هەمیشـەیی پێیانـەوە گـەر لەشـوێنێك خزمەتگوزاریی کتێبخانەی گشتی نەبێت ئەوا کتێبخانەی خوێندنگاکان ئـەو کەلێنـە پڕدەکەنەوە، بەپێچەوانەشەوە کتێبخانەی گشتی ڕۆڵی ئەوان دەبینێـتو لـە خزمـەتی خوێنـدکارانی ئـەو ناوچـەیەدا دەبێـت، هەرچـۆن هـەردوو کتێبخانـەی گشـتیو خوێندنگاکان لە کۆمەڵێك چالاکیدا پێکەوە بەشدار دەبن.

**٤-شێوەی کتێبخانە گشتییەکان:**

کتێبخانە گشتییەکان شێوەیان زۆرە، بەڵام بەرلەوە دەبێ بـزانین کـە دووچـەمکی گرنگ هەیە پەیوەست پێیانەوە، یەکەمیان تۆڕی کتێبخانە گشتییەکان کە کۆمەڵێك کتێبخانەی گشتیی لەیەکچوو دەگرێتـەخۆی (Public Library Network)، کـە کتێبخانەیـەکی ناوەنـدیی کۆمـەڵێك کتێبخانـەی فـەرعی لـە چوارچـێوەی جوگرافیایەکی دیاریکراودا دەگرێتەخۆی.

بەشێوەیەکی گشتی، کتێبخانە گشتییەکان لەم شێوانەدا خۆدەنوێنن:

١-کتێبخانەی هەرێمی، یان کتێبخانەی پارێزگا Regional Library:

کــە خزمەتگوزارییـــەکانی لـــە چوارچـــێوەی پارێزگایەکدایـــە، وەك کتێبخانـــەی ئەسکەندەرییە.

٢-کتێبخانەی ناوەندی Central Library:

کتێبخانەیەکی سەرەکییەو لە ژمارەیەك کتێبخانە پێکهاتووە.

٣- کتێبخانە فەرعییەکان Branch Libraies:

لقـی کتێبخانەیـەکی سـەرەکی، یـان ناوەنـدین، وەك کتێبخانـەکانی دەوروبـەری قاهیرە.

٤-کتێبخانەی شار City Library:

بەجۆرێك درووست دەکرێن کە لە خزمەتی خوێنەرانی شارێکدا بن.

بۆ دانیشتووانی گوندێکی دیاریکراو.

٦-کتێبخانەیماڵی رۆشنبیری:

کتێبخانەی لایەنێکی دیاریکراوە بۆ پەخشی خزمەتگوزاریی رۆشنبیری.

٧-کتێبخانەی منداڵان Children Libraies:

بۆ منداڵانی بەر لە تەمەنی چوونە قوتابخانە تا تەمەنی ١٥و ١٦ ساڵان.

٨-کتێبخانەکانی مەڵبەندەکانی لاوان Youth Centers Libraries:

بۆ خزمەتگوزاریی لاوان لە ناوچەی دیاریکراودا.

٩-کتێبخانەکانی ژنان Women Libraries:

بەتەنیا خزمەتگوزارییان پێشکەش بەژنان دەکەن.

١٠-کتێبخانەی مزگەوتەکان Mosque Libraries:

کتێبی هەمەجۆر لەخۆدەگرێو لە مزگەوتەکاندا دادەنرێن.

١١-کتێبخانەی یانەکان Club Libraries:

بۆ خزمەتی ئەندامانی یانە وەرزشیو کۆمەڵایەتییەکان دەبن.

١٢-کتێبخانەی گەڕۆك Mobil ibraries:

ئەو کتێبخانانەن کە پشت بە ئامێرەکانی گواستنەوە، بەتایبەت ئۆتۆمبیل دەبەستن بۆ گەیاندنی خزمەتگوزاریی کتێبخانەیی بەخەڵکی گوندەکانو ناوچە دوورو چەپەکەکان، ئەم خزمەتگوزارییە بۆ منداڵو گەورەیە.

تەلاری هەر کتێبخانەیەك ئەگەر بەباشی نەخشـەی کێشـرا بێـت، ئـەوا ڕۆڵێکـی گەورەی دەبێت لە ڕاکێشانی خوێنەران بەلای خۆیدا، تەلار بریتییە لە بەرجەستەکردنی بیرۆکەی نەخشەساز لە گوزارشت بۆ مانای پەیوەندیی، کـە یەکـەم جـار لـە فـۆرمی نەخشەو نیگاردا دادەڕێژرێتو پاشان لە فۆرمی سێ مەودایی.

چەمکی کتێبخانەی گشـتی لـەزەینی زۆربـەی ئەنـدازیارانی تەلارسـازیدا، کـەوا پەیوەندیی بەهێزیان نییە بەخزمەتگوزاریی کتێخانەییەوە، بەشێوەیەکی کۆنەو ئـەوان کتێبخانە بە پەرستگای مەعریفە دەزانن، پێییان وایە دەبـێ دووربێـت لـە جـەنجاڵیی ژیانی ڕۆژانەوە، چونکە ئەوان کتێبخانە بە گەنجینەی کەرەسـتە بەنرخـەکان دەزانـنو کارمەندانی دەیپارێزنو، زیاتر لەوەی مەڵبەندی پەخشی مەعریفەو زانیارییەکان بـن، کە ئێستا ئەم چەمکەیان باوە.

زۆربەی تەلارە کۆنەکان گونجاو نین بۆ خزمەتگوزاریی کتێبخانەیی، هاوکات ناکرێ گۆڕانکارییان بۆ بکرێ بۆ مەبەستی باشتر، چونکە بەهایەیەکی شـوێنەوارییان هەیـە، ئەو تەلارانە بەجۆرێك نەخشەکێشراون کە بەتەنیا هەر بۆ کتێبخانە دەست دەدەن.

## هەلومەرجی دروستکردنی کتێبخانە گشتییەکان

**١-جێگا:**

هەندێك لە کتێبخانە گشتییەنوێیەکان کە بەسەرکەوتوو دادەنـرێن، جێگایـان لـە شوێنە سەرەکییەکانی چالاکیی کۆمەڵدان، وەك بازاڕەناوەندکانی شارە گەورەکان، یـان شوێنەکانی دێهات بۆ بازاڕکردن، ئەو کتێبخانانە خزمەتگوزارییان بەشێوەیەکی بـاش

لەگـــەڵ چوارچـــێوەی دەرەوەیانـــدا بەڕێوەدەچـــێت، ئـــەویش بـــەهۆی پەنجـــەرە شووشەییەگەورەکانیانەوە، بەشێکی تریان بەمەبەستی سوودوەرگرتنی نەوەکانی ئایندە وەك تەلاری فراوانو لە شوێنە دوورەدەستەکانی شـاردا دروسـت دەکـرێن، تابتوانـێ ئەرك‌و ڕۆڵی خۆیان بەباشی ببیـنن، بـەڵام بەشـێکی تریـان لـەجۆرە تەلارێکـدان کـە زەحمەتە لەدەرەوە وەك کتێبخانە بناسرێنەوە، چـونکە شـێوەی تـەلارە بازرگانییـەکان وەردەگرن کە دەوری کتێبخانەکانیان داوە.

ئاڕاستەی باو لە ئێستا ئەوەیە کە هامشۆکەرانی کتێبخانە لەگەڵ سـەردانی تـردا سـوودیش لـە کتێبخانـە وەربگـرن، وەك چـوونەبازاڕو چوونەسـەرکارو هاتوچـۆی خوێندنگادا، کتێبخانـە لـە تـەلارە نوێیەکانیـدا، هـەروەکو شـوێنە بازرگانییـەکانی سەرشەقامەکان دروست دەکرێن، واتـە بەشـێوەیەك لەگـەڵ ئەوانـدا بگـونجێن، ئـیتر لەرووی جێگاوە بێت یـان سروشـتی تەلارەکـە، ئەمـەش وا دەکـات لای سـوودمەند پەسەندتربێت لەچاو تەلارە کۆنە شوێنەوارییەکاندا.

لەبـەرجیاوازیی کۆمـەڵگاکان لەیـەکترەوە، دروسـتکردنی کتێبخانـەکان بـەپێی خواستی ژینگەیان جیاواز دەبن لەیەکتر، کتێبخانەیەك کـە لـە ناوەڕاسـتی شـارێکدا دروست بکرێت جیاوازە لەیەکێکی تر کەوا بچووك بێـت‌و لـە گەڕەکێکـدا دروسـت بکرێت، هەرچۆن جیاوازیی هەیە لەنێوان کتێبخانەی لادێ‌و شاردا.

**٢-نەخشەسازیی تەلاری کتێبخانە:**

شێوەی تەلار بەندە بە ژینگەی دەوروبەرەوە، لەکاتی نەخشەسازیی کتێبخانەیەکی نوێدا پێویستە جەخت لەسەر پێداویستی ئەو کۆمەڵگایە بکرێتـەوە کـە کتێبخانەکـە خزمەتی دەکات، هەروەها دڵنیابوون لەوەی کە شـێوەی کتێبخانەکـە لەگـەڵ شـێوەی

باوی ژینگەکەیدا دەبنە تەواوکەری یەکتر، کە ئــەوەش دەبێتــە کاروبــاری گەوهــەریی لەپێشکەشکردنی خزمەتگوزاریی کتێبخانەی گشتیدا، بەڵام جێی داخە زۆربــەی جــار ئەوانە دەدرێنە دەستی تەلارسازو پسپۆڕی کتێبخانە بێ ئاگایە لێی.

دیمــەنی دەرەوە هــانی خــەڵکی دەدات بــۆ چــوونە نــاو کتێبخانــەوە، پاشــان دروستکردنیو نەخشەسازیی نــاوەوەی وایــان لێــدەکات تیایــدا بمێننــەوەو شــارەزابن بەسەرچاوەکانی. دەبێ لەگــەڵ دەســپێکردن بــە درووســتکردنی هــەر کتێبخانەیــەکی گشتیی نوێدا پسپۆڕی کتێبخانە ژمارەی دانیشتووانی ناوچەکە بزانێت، لەگەڵ بــوونی بیرۆکەی روون بۆ شێوەی تەلارەکەو پاشان هــەموو ئەوانــە لەیەکــەم دیداریانــدا بخاتــە بەردەستی تەلارساز.

سیما بەرچاوەکان کەشی کتێبخانەکە نیشان دەدەن، قالدرمەی بەرز بۆ گەیشتن بــە دەروازەی کتێبخانەو دەرگا پــانوپۆڕو ئەســتوورو پەنجــەرەی بــەرز کــە توانــای بیــنین نەڕەخسێنن، هەموو هۆکاری نەرێنی دەبن بۆی، هەروەها گومەزو پایەکان دەشــێ لای تەلارساز سەرنج راکێش بن، بەڵام دەبنە رێگرو دیمەنی نەشیاو لای سوودمەند.

هەرچەندە کتێبخانە بچووکەکان لەشارو گونددا کەمتر دیمەنیان دەبنە پێوانە، بەڵام دەرگای نەشیاوو شووشەی تەرزەییو دابڕانی کتێبخانە لەشەقامەوە بــەهۆی باخچــەی نێوانیان دەبنە لەمپەر.

هەندێ جاری دیکەش گرفتــەکان دەســتکردی خۆمــانن، جێگــای چــاودێریی بــەر دەروازەو دەرگای چوونە دەرەوەو قەتیسدانی سەرچــاوەکانی کتێبخانــە لــە بەشــەکانی خواستنو ژێدەرو منداڵاندا بەتەنیاو کەموکوڕیی لە ئاماژە پێویستەکانداو بایەخ نەدان

بە هامشۆو هاتوچۆی ڕێكوپێكی سوودمەندان لـە نـاو تـەلاری كتێبخانـەدا هـەموو هۆكار دەبن بۆ شێواندنی تەلارو ساردكردنەوەی هامشۆكەران.

هەرچۆن دەبیَ پسپۆڕی كتێبخانە چەند هـەنگاوێك بنێـت بەمەبەسـتی زاڵ بـوون بەسەر گرفتی كـەمیی سـوودمەنداندا، ئـەویش لـەو ڕووانـەوە كـە بەنـدن بەشـوێنی كتێبخانەو نەخشەو دابەشكردنی ناوخۆییەوە ئەگەر كتێبخانە لە رووكـاری دەرەوەیـدا پێوەی دیـار نـەبیَ كـە كتێبخانەیـە ئـەوا دەبێـت تـابلۆی بـۆ دانـریَ كـە لەسـەری نووسرابیَ(كتێبخانە)، هەرچەندە زۆر لە تەلارسازان دژی ئـەوەن بەنووسـین كتێبخانـە بناسرێتەوە، بەلاّم نەخشەسازیی باش‌و دانانی تابلۆ بەشێوازی هونەرییانە دەبنە مایەی سەرنجی هامشۆكەران.

كەسوودمەند دەگاتە دەرەوەی تەلاری كتێبخانە ئەوا پێویستی بەوەیـە هانبـدرێت بۆچوونە ژوورەوە، ئەمەش خاڵێكی گرنگە لە پێشكەش كردنـی خزمەتگوزارییـەكانی كتێبخانەی گشتی، چونكە زۆریان رانەهاتوون پێی، هەرچۆن بەشـوێنێكی بازرگـانیی نێو بازاڕ راهاتوون، بەلاّم بەكارهێنانی كتێبخانە جیاوازە.

باشترین رێگا ئەوەیە هانی خەڵك بدرێت بۆ چوونە نـاو كتێبخانـەوە، ئـەویش بـە بینینی ناوەوەی كتێبخانـەو چـۆنیتی بەڕێوەچـوونی هەنـدیَ لـە كاروبارەكـان لـەرێی درووستكردنی پەنجەرەو جامخانەی گەورە گەورە لە نهۆمی سەر زەویدا، لەگەڵ دەرگـای شووشەیی، تابتوانرێت لێوەیانەوە تەماشای ناوەوە بكرێت، لەگەڵ بەكارهێنانی جـۆرە دیكۆرێك كەوا هاندەربێت بۆ پێشوازیو سوودمەند لێی نەسڵەمێتەوە، هەرچـۆن ئـەو جۆرە تەكنیكە لە شوێنە بازرگانییەكاندا بەكاردێت.

هاوکات گەر کتێبخانە کەوتە نهۆمەکانی سەرەوە، ئەوا بیرکردنەوە لە قالدرمەو ئەسانسۆرکارێکی زۆر پێویستە، دەبێت لە دەروازەی کتێبخانەوە بۆ هۆڵی پێشوازیی، تابلۆو ئینجانەو سەوزایی دابنرێت، لەگەڵ رەنگی بۆیەی گونجاوو روناکیی تەواو، ئەمانە بەر لە گەیشتن بە پرسگە..

سەرکەوتووترین کتێبخانە ئەوەیە کە سوودمەند بەروونی هەموو نەخشەی تەلارەکە ببینێت بەتەنیا لە گوزەرکردنیدا بە هۆڵی پێشوازییدا، گەر وانەبوو ئەوا پێویستە رێنمایی سوودمەندان بکرێت بۆ بینینەوەی بەشە جیاوازەکانی ناو تەلارەکە.

بوونی تابلۆکانی رێنمایی کردن زۆر پێویستن، تا سوودمەند بەدیتنیان شارەزایی پەیدا بکات، بەلام تا ئەم ساتە ئەو رێنماییانە لەشوێنە بازرگانییەکانو ویستگەکانی شەمەندەفەرو نەخۆشخانەو شوێنەگشتییەکان رۆڵی خۆیان دەبینن.

### ٣-نەخشەسازیی ناوەوەی:

بێگومان نەخشەسازیی ناوەوەی کتێبخانە بایەخی تایبەتی هەیە لە پێشکەش کردنی خزمەتگوزاریی کتێبخانەییدا، بەکارهێنانی رەفەی کراوە هەنگاوێکی گەورەیە تاوەکو کتێبخانەکان پێشوازیی زیاتر بکەن لە سوودمەندان. لەگەڵ بەردەوام بوونی بەکارهێنانی دەروازەکانو دیاردەی چاودێری کردنی جووڵەی سوودمەندەکاندا، هەرچۆن بەکارهێنانی ئامێرەکان لە نەخشەسازیی ناوەوەدا، کە قەوارەیان بچووکەو رێگرنابن لە هاتنە ژوورەوەی سوودمەنداندا.

بەشە تەقلیدییەکان گۆڕانی ئەوتۆیان بەسەردا نەهاتووە، ئەوانیش ئەو بەشانەن کە لەگەڵ بوونی کتێبخانەگشتییەکاندا لە کۆنەوە هەبوون، واتە بەشەکانی: ژێدەر، خواستن، مندالان، بەلام بەشی تۆمارە دەنگییەکان کە تارادەیەك لەبەشە نوێیەکانەوە

جێگایەکی لە هۆڵەکانی خوێندنەوەی ناوخۆیی بۆ تەرخانکراوە، ئەوەش داخوازییەکارگێڕییەکان دێنێتە دی زیاتر لە پێویستیی سوودمەندان.

لەگەڵ ئەوەدا کە داخوازیی خوێنەران بۆ زانیارییەکان لەم ساڵانەی دواییدا زیادیان کردوە، بەتایبەت لەگەڵ زۆربوونی ئاڵۆزیی لەلایەنە جیاوازەکانی ژیاندا، بەڵام دەرکەوتنی کاردانەوە لەلایەن کتێبخانەگشتییەکانەوە بەشێوەیەکی سستە، ئەوەش لەگەڵ زۆربوونی نووسینگەکانی زانیارییدا دوور لە کتێبخانەکان سەلماوە، چونکە خەڵکی بەگشتی وا دەزانن کە کتێبخانەی گشتی بەتەنیا بۆ خواستنی کتێبە.

دەشێت زۆر لە خەڵکی بزانن کە کتێبخانە کارئاسانی دەکات بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستیو لێکۆڵینەوەکان، بەڵام کەمیان دەزانن کە جێگایەکە بۆ خزمەتگوزاریی زانیارییەکان، هەڵبەت ئەو جۆرە ئاسانکارییە لەزۆر کتێبخانەی گەورەو مام ناوەندیدا ئەنجام دەدرێن، بەڵام هێشتا وەك پێویست نییە، هۆکاری ئەوەشی تێڕوانینی تەقلیدییانەی بەشەکانی سەرچاوەکانو ژێدەرەوەیە کە زۆرجار دەکەونە ناوەوە، یان بەشی پشتی کتێبخانە، بەوپێیەی دوورە چاونو هامشۆی سوودمەندانیان بەسەرەوە نابێت!

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کەوا جیاوازیی لەنێوان خزمەتگوزاریی سەرچاوەکانو زانیارییەکاندا بکرێت، هەروەها لەنێوان سەرچاوەکانی گەورەو منداڵدا، چونکە هەریەك لەوانە داخوازیکاری تایبەتی خۆیانیان هەیە.

کاتی ئەوە هاتووە بەشی خواستن لەبەشی پێشەوەی کتێبخانە گشتییەگەورەکاندا نەهێڵرێت، تاوەکو بتوانن بایەخی زیاتر بدەنە پێشکەکردنی زانیاری گشتیو گەشتوگوزاریو مەدەنیی لەرێی سەنتەرەکانی زانیارییەوە، ئەگەر سەنتەری

زانیارییەکان لە بەشی پێشەوەی کتێبخانەدا بێت ئەوا هامشۆکەر هەر لە چوونەژوورەوەیدا دەیبینیٚو سوودی لیٚ وەردەگرێت.

ڕێکخستنی ناوەوەی کتێبخانە، ئەگەر لقێکی بچووکی کراوەو دابەشنەکراوبێت بەسەربەشەکاندا، یان کتێبخانەیەکی گەورەی دابەشکراو بێت، دەبیٚ تیایاندا کەشەگشتییەکە ببینرێتەوە، کەدیارە لە ناوچەیەکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە. بۆ نموونە لەبەشی خواستندا کەوا پێویستی بەرووبەرێکی فراوانترە تاسوودمەندان جووڵەی تەواوی تیایدا بکەن، هەرچۆن پێویستی بەسیماکانی دیکۆرو روناکی هەیە. ئەوەش بەسەر بەشی منداڵاندا جیٚبەجیٚ دەبێت کەوا پێویستی بە رووبەری گونجاوە بۆ دارِشتنی خشتەی چیرۆك بۆخوێندنەوەیان، یان خوێندنەوەی دیکەی خۆیان، لەگەڵ بەکارهێنانی بنمیچی نزمترداو دانانی کورسییەکانیان بەشێوەی دژەباو، هەرچۆن لەبەشی سەرچاوەکاندا پێویسمان بە دیکۆری سادەترو روناکی نزمە، جیاواز لەو روناکییەی لە هۆڵەکانی خوێندنەوەدا لەبەرزتردا دادەنرێنو ئاراستەی سەرمێزەکان دەکرێن.

دەبیٚ ئەوەشمان لەبیربێت، کە دیکۆری کتێبخانە بەشێوەیەکی سەرنج راکێش بێت، چەندە ساکاریش بێت، ئەوا جیاوازیو زیندوویی دەبەخشێتە ناوەوەی تەلارەکەیو هانی سوودمەند دەدات هەرخۆی هەموو بەشەکانی بەسەربکاتەوە، لەوکاتانەدا هامشۆکەر لە تواناکانی کتێبخانە، لەرووی تەلارو کەرەستەو سەرچاوەو کارمەندانی تێدەگاتو دەزانێت سەرچاوە بێت یان زانیارییەکان چۆن سوود وەردەگرێت.

کتێبخانە دەتوانێت رۆڵێکی دیکەش ببینێت، ئەویش هاندانی فێربوونی خودیی نافەرمییە، کە ئەویش دابینکردنی کەرەستەی دەویٚ تا هانی ئەوانە بدات کە خۆیان

پەروەردە دەکەنو بەئاسانی بەنێو سەرچاوەکاندا بگەڕێن، ئەویش بەو واتایە نییە کە سەرچاوەکان تێکەڵ بەیەك بکەن، بەڵکو بزانن چۆن بەکاریان دێننو سیستمی بەڕێوەچوونی کتێبخانە بپارێزن.

ئەوەش پێویستی بە پراکتیزەکردنی سیستمی (ڕێنمایی ئاڕاستەکراو) هەیە لەلایەن کارمەندانەوە، لەگەڵ چۆنێتی نمایشی سەرچاوەکان، بەرەچاوکردنی ریزبەندیو ڕێکخستنیان دوای ئەنجامدانی کارە هونەرییەکان لە کتێبخانەدا.

پێویستە کارمەندی شارەزاو پسپۆڕی کتێبخانە هەر لەسەرەتاوە بەشداربێت لە نەخشەکێشانی کتێبخانەدا، رۆڵی ئەو وەك کەسێکی تایبەتمەندی هاوکاری ئەندازیاری تەلارساز دەبێت، لەبەرامبەردا دەبێ ئەندازیاریش رۆڵی ئەو بەگرنگ بزانێو راوێژی پێ بکاتو بەیەکێك لە گروپی نەخشەسازیی بزانێت، چونکە زۆر تەلاری جوان هەن کە تەلارسازانی بەتوانایان لەپشتەوەیە، بەڵام وەك کتێبخانە هەرگیز سەرکەوتوونین، کتێبخانە باشەکان بە هاوکاریی توندوتۆڵی ئەو دوولایە هاتوونەتە ئەنجام، کارمەندیش دەبێ شارەزای تەواو بێت لەپیشەی خۆیداو لەکەسانی دی زیاتر بزانێت، بۆهێنانە ئارای کتێبخانەیەك کە خەڵکی دەوروبەری سوودمەندبن لێی.

**٤- پاراستنی کتێبخانە:**

کاتێك پسپۆڕی کتێبخانە لەگەڵ تەلارسازدا بۆ نەخشەسازیی کتێبخانەیەکی نوێ کۆدەبێتەوە، یان بۆ چاککردنی کتێبخانەیەکی کۆن، پێویستە ئەوە لەبەرچاو بگرن کە تەلاری کتێبخانەکە بۆ ساڵانێکی زۆر دەدەمێنێتەوەو خزمەتگوزاریی پێشکەش بە کۆمەڵگا دەکات.

ئەگەر کارەکەیان بەباشی مەیسەر کرد، ئـەوا کۆمــەڵگا ســوودمەند دەبێـت لــەو کتێبخانەیە کە دەبێت نموونەیی بێت بۆ نمایشــی خزمەتگوزارییــە کتێبخانەییــەکانی، گەر وانەبوو، ئەوا جوانییەکەی تەنیا لەرووە تەلارسازییەکەیدا دەڵێت.

کورتبینییە گەر نەخشەی کتێبخانەیەك لەرووی فۆرمەوە جوان بێت، بەڵام توانــای مانەوەو پاراستنی لــە هۆکــارە دەرەکییــەکانی وەك کەش‌وهــەوا لاوازبێــت، هەرچــۆن لەناوەوەش کەرەستەو دیکۆرەکانی بــەجۆرێك بــن بەرگــەی بــەکارهێنانی زۆر نــەگرن. هاوکات ئــەو ماددانــەی لــەناوەوە، وەك بۆیــاخ‌و رووپۆشــی کەرەســتەکان لــەناوەوەو رووکارەکانی دەرەوەی نابێت لەو جۆرانە بن کە لە هەندێك تــەلاری نوێــدا بــەکاردێن‌و گونجاونین بۆ کتێبخانە.

هەربۆیــە پێویســتە لەســەر پســپۆڕی کتێبخانــە لــەپێناوی پێشــکەش کردنــی خزمەتگوزارییەکان بۆ ماوەی دوورودرێژ، داوا لە ئەنــدازیاری تەلارســاز بکــات کــە دیمەن‌و رووکاری دەرەوەی کتێبخانە بەجۆرێك بێت جوان‌و خاوێن‌و سەرنج راکێشبێ بــۆ سالانی داهاتوو، هاوکات پێویستە کارمەند ڕێنمایی تەلارساز بکات بە ئاست‌و پلەی بــەکارهێنانی تــەلاری کتێبخانــە، تــاوەکو هــەر لەماوەیــەکی کەمــدا رووبــەڕووی لەناوچوون‌و داڕوخانی کتێبخانەو خراپبوونی کەرەستەکانی نەبنەوە.

درووستکردنی تەلاری کتێبخانە پرۆژەیەکی هاوبەشە لەنێوان پسپۆڕی کتێبخانــەو تەلارسازدا، تا ئەوکاتەی تەلارەکە تەواو دەبێت، لەگــەڵ تەواوابوونیــدا بەرپرســیاریی کتێبخانەکە بەتەنیا دەکەوێتــە ئەســتۆی کارمەنــدەوە، هــەر لــە پاراســتنی رۆژانــەی تەلارەکەوە تادەگات بە پێکهاتەو کەرەســتەکانی، چــونکە زۆر کتێبخانــەمان بینیــوە لەکاتی کردنەوەدا لەجوانترین شێوەدا بوون، بەڵام بەهۆی بایەخ پێنــەدانی پێویســتەوە

لــە لایەنــە کتێبخانەییەکــەوە وردە وردە ئــەو جوانییــە نــەماوەو دواتــریش بــەجۆرێ فەرامۆشکراوەو دارِزاوە کە بەتەواویی دیمەنەکەی ناشرین بووە.

چــەند هۆکارێــك دەبنــە دیاریکــەری باشــیی، یــاخود خراپیــی خزمــەتگوزاریی کتێبخانــە، لەوانــە قــەبارەی سەرچــاوە کتێبخانەییــەکانو رووبــەری گەنجینــەکانی سەرچاوەکان، هەروەها ژمارەو توانای کارمەندەکان، لەگــەڵ جــوانیو ئاســتی بــاشو خراپی کتێبخانەکە لە درووستکردنو کەرەستەکانیدا.

لەگەڵ کردنەوەی هەر کتێبخانەیەکدا، نویێ بێ یان نــۆژەنکراوو پۆشــتەکراو، هــەر لەرِێوە چۆنێتی کتێبخانەکە دەردەکەوێتو هاندەر دەبێت بــۆ راکێشــانی ســوودمەندان بەلای خۆیدا، هەرچــۆن سەرچــاوەکانی کتێبخانــەو کارئاســانیو خزمەتگوزارییــەکان دەبنەوە هۆکاری سوودبینین، هاوکات جوانیو خاوێنیی کتێبخانەکــە رۆڵــی گرنگیــان هەیە، بەتایبەت کە زۆر لە دامەزراوە گشــتییەکاندا ئاســتی خــاوێنیی لــە پلەیــەکی نزمدایە.

مرۆڤ بەخێرایی لەگەڵ دەوروبەردا رادێت، بەڵام بەکارکردنی رۆژانــە لەجێگایــەکی وەك کتێبخانەدا زەحمەتە سەرنجی هەموو تۆزو پیسییەك بدرێت کە بەکەرەستەکانەوە، یان بەقاچی کورسییەکانو مێزەکانو دۆلابی کتێبەکانەوە بێت، یان بەراخەرەکانــەوە، یاخود سەرنجی جێگا پەنجــەی ســەر دیــوارو شووشــەو کەرەســتەکان بــدرێت، کەواتــە ماوەیەکی دەوێت بۆ پاککردنەوەی هەموو ئەوانە، دەبێ بشزانین کە پیسیی سەر رەنگە کراوەکان زووتر دەردەکەون وەك رەنگە داخراوو تاریکەکان، بەتایبــەت لەســەر بەشــی خوارەوەی دیوارەکان، هەربۆیە دەبێت(بۆ نموونە) لەراخســتنی فــەرشو کومبارەکانــدا چەند پەنجەیەك بەلای دیوارەکاندا بەرزبکرێنەوە.

هەروەها لەکاتی هەلبژاردنی کەرەستەو کەلوپەلدا رەچاوی ئـەوە بکرێـت کامانـە درەنگ پیس دەبن‌و زووش پاك دەکرێنەوە.

دەبێ کارمەند لەوە ئاگادار بێت کە جوان راگرتن‌و خاوێنیی کتێبخانە کەمتر نییە لـە خزمەتگوزارییـە کتێبخانەییـەکان، ئـەو تەلارانـەش کـە پارێزگارییـان ئاسـانە لەئاستێکی بـالآدا دەبـن‌و بـۆ ماوەیـەکی درێـژ سـەرنجی هامشـۆکەران رادەکێشـن، لەوکاتەشدا باشتر خزمەتگوزارییەکان پێشکەش دەکرێن، هاوکات پێویسـتە کارمەنـد جەخت لەسەر ئەوە بکاتەوە کە ئەوانەی کاری پاککردنەوە دەکەن لێزان‌و راهێنراو بن.

هەرچۆن پەیوەندیی توندوتۆڵ هەیە لەنێوان پاك‌و خاوێنی‌و جـوانی‌و رێکخسـتندا، چونکە هەموویان دەبنە جێبایەخی ئەو شوێنە، دیارە کـاری کارمەنـد پەیوەسـتە بـە خەڵکە هامشۆکەرەکەوە، ئیتر سروشتییە کە لەهەندێ کاتدا فشاری زۆر بکەوێتە سەر کتێبخانەو لەو کاتانەدا کاریگەریی دەکەوێتە سەر سیستمی کارو چۆنێتی رێکخستنی خزمەتگوزارییەکان.

پێویستە لەو کاتانەدا کارمەندان پارێزگاریی لە هێمنی بکەن‌و بەمێشکی ئـارام‌و کارکردنی زۆرترەوە ئەرکەکانیان ئەنجام بدەن، چونکە پیشەی کتێبخانەیی پێویستی بە کەسانی زیرەك‌و کارزان‌و لێهـاتوو هەیـە، دیـارە هـەموو ئەوانـەش لـەژێر سـێبەری سیستمدا بەڕێوە دەچن‌و ئەنجام خزمەتگوزاریی گەورەی لێ سەوز دەبێت.

هەڵبەت پارێزگاریی لە تەلارە نوێیـەکان ئاسـانترە لـە تـەلارە کۆنـەکان، چـونکە زەحمەتە نەریتی کارکردنی جێگا تەقلیدییەکان هەروا زوو بگۆڕێن، بەڵام لەنوێیەکانـدا هەر لەسەرەتاوە کارکردنی نوی دەستپێدەکات‌و ئاڕاستەی کاری جیاوازی کارمەندەکان دەردەکەوێت، لەوانیشدا هەن بەسروشتی خۆیان رێك‌وپێکن‌و لەژیاندا پەیڕەوی شێوازی

باش دەکەن، ئەوانە بەرهەمی کارکردنیان زوو دەردەکەوێت، بەڵام ئەوانەی بەوجۆرە نین، دەکرێ هەڵسوکەوتیان لە کارکردنی بەردەوامدا بگۆڕێت، هەربۆیە پێویستە لە کارگێڕیی کتێبخانەوە(بەڕێوەبەرێتییەوە) پێودانەکانی کارکردنیان پێ رابگەیێنرێت، هاوکات دەبێت(لێپرساو)، یان بەڕێوەبەر زوو زوو بەشەکان بەسەربکاتەوە بۆ دڵنیابوون لە پارێزگاریی تەلارو کەرەستەو سیستم لەخزمەتی سوودمەندا دەبێت، گەر کارمەند لەپشتی مێزەکەیەوە دابنیشێتو لەسەر مێزەکەی کتێبو کاغەز کۆمەڵ بێت، ئەوا زەحمەت دەبێ لەو جێگایەدا مامەڵە لەگەڵ سوودمەنددا بکرێتو ناتوانێ سۆراغی ئەوان جێبەجێ بکات، هەرچۆن سوودمەندیش ناتوانێ پرسیارەکانی ئاڕاستە بکاتو بەباشیو خێرایی وەڵامیان چنگ بکەوێت.

دەبێ لەنێو کارمەنداندا سەرنجی ئەوانە بەهەند وەربگیرێت کەوا هەموو شتە وردەکانیش دەبینن، بۆ نموونە کە دەبینن بەهۆی باوە تەپوتۆز جێگایەك پیس دەکات، یان هەڵواسینی ریکلامەکان لەسەر شووشەی دەرگاکان ئەو ناوە تاریك دەکەن(کە دەبێت تەنیا بەتابلۆی ریکلامەکانەوەبن)...

دوای بەسەرچوونیشیان لێ بکرێنەوە، پاشان دەبێ سەرنجی زۆرشتی تر بدرێت، وەك رێكوپێکی پرسگەو وەڵامدانەوەی هامشۆکەران، کارتەکانی پێڕستو کارتی گیرفانی کتێبەکان، تەپوتۆزی سەر ئامێرەکانی روناکیو شووشەو جاخانەکانو گەنجینەو...تاد.

هەروەها دەبێت سەرنجی رێكوپێکی دانانی کتێبەکان لە تاخچنی دۆڵابەکانیاندا بدرێتو بڕوانرێنە ژمارەی پۆلێنی سەر لێوارەکانیانو بزانرێت بەروونی دیارە یان داخوراوە، هەروەها پێویستە سەرنجی پاكو خاوێنی کتێبخانەی گەڕۆك بدرێتو بزانرێت کە ناو ئوتومبیلەکە خاوێنەو دواجار کەی خاوێن کراوەتەوە؟

ئەوانە چارەسەریان ئاسانە، بەڵام فەرامۆشیان ئەنجامی باشی نابێتو رایی کردنیان بە کارمەندانی پسپۆڕو ئاسایش دەکرێتو ئەنجامیشی وێنەی کتێبخانە وەکو خۆی لەمێشکی سوودمەنداندا دەچەسپێت.

گەر کتێبخانەیەك بەردەوام پارێزگاریی بکرێت ئەوا دەبێتە هۆکاری سەرنج راکێشانی سوودمەندەکانی و کارمەندیش دەتوانێ خزمەتی خۆی بەجوانیو کاریگەرییەوە تیادا بکات، هەر ئەوەش جیای دەکاتەوە لە کتێبخانەکانی تر گەر لەئاستی پێویستدا نەبن، گەر تەلاری کتێبخانە خاوێنو جوان بێ ئەوا سەرچاوەکانیشی رێكوپێك دەپارێزرێن، هاوکات کارمەندیش تیایدا خزمەتی زیاتر پێشکەش دەکات. لەمەسەلەی بەبازاڕکردندا لە بازرگانیدا چۆنێتی نمایشی کاڵاکان رۆڵی گەورە دەنێت، لەکتێبخانەشدا کە ئامانج سەرنج راکێشانی خوێنەرو سوودمەندە، چۆنێتی نمایشو دانانی سەرچاوەکان لەهۆڵەکانیاندا رۆڵی گرنگی هەیە، دەشێ خراپ دانرابنو دەشێت جوانو لەجێی خۆیان دانرابنو لەو کاتانەشدا سوودمەند بەباشی لەگەڵ سەرچاوەکاندا کارەکانی ئەنجام بدات.

هەندێ جار، لایەنی تر نمایشی کتێب ساز دەکەن، کە پەیوەندیی راستەوخۆی بە خزمەتگوزاریی کتێبخانەییەوە نییە، بەڵکو نمایشەکانیان بۆ وەرگرتنی زانیارییە لەسەر بایەخی کۆمەڵگا، لەهەندێ وڵاتیشدا پەیوەندیی تەواو هەیە لە نێوان کتێبخانە گشتییەکانو مۆزەخانەکاندا، مۆزەخانەکان پێشانگای هەمیشەیی دەکەنەوە بۆ کتێبخانەکانو کارمەندانیان سەرپەرشتیو پارێزگاریی دەکەن، ئەوەش جێبایەخی ترە بە کتێبخانە، هەرچۆن درووستکردنی گرنگیی کتێبو کتێبخانەیە لەناخی هامشۆکەرانی مۆزەخانەدا کە بایەخ بەمۆزەخانەکان دەدەن.

لایـــەنێکی تــر لــە پاراســتنی کتێبخانــە پەیوەســتە بــە دڵنیــابوون لــەوەی خزمەتگوزارییەکان بەکۆکیو ڕێکیو تواناوە دەچن بەڕێوە، گرتنەبەری ڕێگای راسـت بۆ بەڕێوەچــوونی کاروبــارە ڕۆتینییــەکانو دابەشــکردنی کارمەنــدانو پێشــوازیی لــە هامشــۆکەران لــە تــەلاری کتێبخانــەدا هۆکــار دەبــن بــۆ بەرزکردنــەوەی توانــای خزمەتگوزارییــە کتێبخانەییــەکانو تونــدوتۆڵکردنی پەیوەنــدیی کتێبخانــە بــە هاووڵاتیانەوە.

چەندە کارمەند خاوەنی ئەزموونی فراوان بێت لــە دەســتەبەرکردنی سەرچــاوەکانی کتێبخانەو ئامادەکردنیانداو نزیکیی تەواوی لە خزمەتگوزاریی کتێبخانــەو راهــاتنی لەگەڵیدا، ئەوا ئەوەندەی تــر تواناکــانی زیــاد دەکــات بــۆ دیــاریکردنی میتۆدەکــانی کارکردنیو باشکردنی خزمەتی ڕۆژانەی.

**ڕێکخستنی جووڵەی سوودمەندان**

کاتێك سوودمەند بەمەبەستی جیاواز دێتە کتێبخانە، دەتوانی لەیەك جاردا ســەر بەچەند بەشێکدا بکات، بەوەش تێڕوانینی بۆ کتێبخانە تێڕوانینێکی باش بێت، گــەر توانی بەخێرایی بچێتە نــاو کتێبخانــەوەو چــی ویســت بەئاســانی دەســتی بکــەوێت، بەخێراییش کتێبخانە جێبهێڵێت، ئەوا مەبەستەکانی هاتووەتەدی.

دەبینین چەندە ناخۆشە کەسێك لەریزی سۆپەرمارکێتێکدا بوەستێ تا پارە بــدات، یان لەریزی بانکــداو کارمەنــدانی زۆر لــەودیوەوە ببینــێ ســەرقاڵی کارەکانیــان بــن، بەهەمان شێوە کە لە پرسگە، یــان لەبەشــی خواســتندا لــەریزدا بێــت، هەســتدەکات کتێبخانە توانای رایی کردنی کارەکانی نییە.

هەرچەندە خزمەتگوزاریی کتێبخانە، لە کتێبخانەیەکەوە بۆ یەکێکی ترو لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە، بەڵام دەتوانرێ سەعاتەکانی کار ڕێکبخرێتو سەعاتی زیادە بخرێتە سەر کارکردن لەکاتی پێویستدا، بەڵام دەبێ ڕەچاوی هەستیاریی بەشی خواستن بکرێت، کە دەکەوێتە نزیك دەروازەی سەرەکیی کتێبخانەوە، گەر کتێبخانە قەرەباڵغ بوو، ئەوا دەبێت کاوەنتەرێك تەرخان بێت بۆ خواستنو یەکێکی تر بۆ گێڕانەوەیان.

پاشانیش بەکارهێنانی ئامێر بووەتە کارێکی پێویست، بەتایبەت کە ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان ڕۆڵی گەورەیان هەیە لە جێبەجێکردنی داخوازیی سوودمەنداناو نەهێشتنی قەرەباڵغی لەنێو کتێبخانەدا.

### خزمەتگوزاریی کتێبخانەی گەڕۆك

پارێزگاریی لەکات لە خزمەتگوزاریی کتێبخانەی گەڕۆکدا بایەخی خۆی هەیە، چونکە سروشتی بەڕێوەبردنی کتێبخانەی گەڕۆك بەجۆرێکە سوودمەندان لەناوچەیەکی کراوەدا لەچاوەڕوانیدا بن، ئیتر ڕەوشی ئاوو هەوا بەهەر جۆرێك بێت، ئەگەر ئوتومبیلی گەڕۆك جارێك دواکەوت، یان هەر نەگەیشتە شوێنی مەبەست سوودمەندان گرژو تووڕە دەبن. ڕێکخستنی ئەو خزمەتگوزارییە و ڕاگرتنی وادەی گەیشتنی ئوتومبیلەکان، پەیوەستە بە سێ هۆکارەوە، پارێزگاریی لە ئوتومبیلو چاککردنەوەی کەموکورتییەکانی هۆکاری یەکەمن چونکە پەککەوتنی بەردەوامی دەبێتە هۆی سەرنەکەوتنی خزمەتگوزارییەکە، دووەم خشتەی هێڵەکانی هاتوچۆیە کە دەبێ دیاریکراوو بەپێی کاتی دیاریکراو بێت، سێیەمیش بەخششی کارمەندانە بۆ جێبەجێ کردنی خزمەتگوزارییەکە.

لەکاتی گرفتی ئوتومبیلەکاندا، دەبێ بە تەلەفون گروپی سوودمەندان ئاگاداربکرێتەوە، هەرچۆن دەبێ لەرێی رادیۆ ناوخۆییەکانەوە زانیاریی سەبارەت بە پەککەوتنی ئوتومبیلی کتێبخانەو دواکەوتنی رابگەیەنرێت، هەرچۆن بەهەڵواسینی پۆستە، لەشوێنە گشتیو بازرگانییەکان ئەو مەبەستە دەگەیەنرێتو وادەی چاککردنەوەو گەیشتنی ئوتومبیل دیاری دەکرێت، پێویستە کتێبخانەی گەڕۆك بەلای کەمەوە دووئوتومبیلی هەبێت بۆ رایی کردنی کارەکانی.

پێویستە نزیك شوێنی کتێبخانەی گەڕۆك تابلۆی رێنیشاندەر هەبێت، هاوکات ئامادەکردنی بڵاوکراوەی بچووك سەبارەت بەکتێبخانەکەو وادەی کارەکانیو شوێنی راوەستانی ئوتومبیلی گەڕۆك، سوودی باشی دەبێت.

پێویستە هەر گۆڕانێ لە سەعاتەکانی کارکردنی کتێبخانەکەدا رووبدات، رابگەێنرێت، ئەویش لەچەند رۆژێك بەر لەگۆڕانەکان.

**٥- کەلوپەلو کەرەستەکان:**

پەیوەندی تەواویان هەیە بە تەلاری کتێبخانەوە، چونکە بەبێ کەرەستەو کەلوپەلەکان کاری کتێبخانەیی بەڕێوە ناڕوات، لەوەبەر بایەخی ئەوتۆ نەدەدرا بەوانە، وا دەزانرا بە بوونی سەرچاوەو کتێبەکانو شتێك کەلوپەل، کارەکان رایی دەبن، ئیتر رەچاوی جۆری کەلوپەلەکان نەدەکرا.

لەم سەردەمە نوێیەدا بایەخدان بە کەلوپەلەکان زیادی کردوە، چونکە دەزانرێت چ رۆڵێکی هەیە بۆ کاری کتێبخانە لە کۆمەڵگادا، هەروەها بۆ بەرژەوەندیی سوودمەندانی کتێبخانەو سوودوەرگرتن لە خزمەتگوزارییەکانی، هەربۆیە ئەمڕۆ

گـەلێك تایبەتمەنـدیو پێوانـە دەبیـنین کـە پێویسـتە لـە کـاتی پـڕ کەرەسـتەکردنی کتێبخانەدا ڕەچاو بکرێن.

**کەلوپەلی کارمەندان**

پێویستە هەر کتێبخانەیەك کەلوپـەلی گونجـاو بـۆ کارمەنـدەکانی دابـین بکـات، ئـەویش لـەپێناوی ڕاپەڕانـدنی کاروبـاری کارمەنـدی بەشـەکانی وەکـو: خواسـتن، گەڕاندنەوەی سەرچاوە کتێبخانەییەکان، ڕێنمایی خوێنەرانو بەشەکانی تر، هەندێك لە کتێبخانەکان ئەوەیان لەلاباشە کە خواستنو گێڕانـەوەی سەرچـاوەکان ناوەنـدیی بـنو ئەنجامدانیان لە جێگایەکـدا بێـت لـەدەرەوەی تـەلاری خـودی کتێبخانەکـەدا، بـەڵام زۆربەیان وایان بەلاوە پەسەندە ئەو کارانە لەناو کتێبخانـەدا ئـەنجام بـدرێت، ئـەوەش پێویستی بە رووبەرێکی باشە تا کەلوپەلی تەواوی تیادا دابنرێت، ئـیتر کەلوپەلـەکان بریتی دەبن لە دۆلاب‌و مێز و جێگای دانانی کتێبەکان کە دەخوازرێنو تۆمار دەکرێن، هەروەها ئەوانەی دەهێنرێنەوە تا لە جێگای خۆیاندا دادەنرێنەوە.

دەکرێت بۆ کتێبخانەی بچـووکی منـداڵان جێگـای بچـووکترو کەلوپـەلی کـەمتر تەرخان بکرێت، بەڵام لە کتێبخانە گشتییەکاندا پێویسـت بـە جێگایـەك دەکـات بـە تایبەت بۆ خواسـتن نەخشەکێشـرا بێـت، تـاوەکو بتـوانرێ مامەڵـە لەگـەڵ زۆرتـرین هامشۆکەردا بکرێت، ئەو جۆرە نەخشەسـازییە وا دەکـات چـاودێری هاتنـە ژوورەوەو چوونە دەرەوەی سوودمەندانو سەرچاوە خوازراوەکان بکرێت، کەواتە پێویستە لە نزیك دەرگای سەرەکییەوە بێت کە سوودمەند هامشۆی لێوە دەکات.

باشتر وایە ئەمینداری کتێبخانە ئەو کارە ڕۆتینیانـە بـۆ گروپێـك لـە کارمەنـدە هاوکارەکانی جێبهێڵێت، تاوەکو خۆی بواری هەبێت بۆ گفتوگۆ لەگـەڵ سـوودمەندانو

یارمەتیدانیان، هەروەها بۆ تێگەیشتن لە کێشەکان، پێویست وایە بۆ ئەو جێگای ڕێنمایی کردنە ژوورێك دوور لە دەروازەی کتێبخانەوە درووست بکرێت، بەڵام لەبەرچاودا بێتو خوێنەر بەئاسانی بیگاتێ، هەرچۆن پێویستە کەلوپەلی پێویست بۆ ئەو جێگایەش دابین بکرێت، هەرچۆن دەبێ ئەو (نووسینگەیە) نزیك بێت لە شوێنی بابەتە بیبلیۆگرافیاییەکانو لیستو ڕێبەرەکان کەوا خوێنەر کاری پێیان دەبێت.

## کورسییەکان

پێویستە سوودمەند بتوانێت خۆی بەرزیی کورسیو پشتەکەی ڕێکبخات، تابتوانێ بەباشی لەسەری دابنیشێتو بخوێنێتەوە، تاوەکو بەویستی خۆی پشتەکەی بۆ پێشەوەو دواوە بجولێنێتەوەو چۆن پێی خۆشە دابنیشێت. هەرچۆن پێویستە جولاندنەکان بەئاسانی بەدەستیەوە بێنو کورسییەکەی بەکەڵکی دانیشتنی بێت، بەوەش کتێبخانە چالاکانەتر خزمەتی خوێنەرانی دەکات.

## ژوورەکانی چالاکیی منداڵان

پڕکردنەوەی پانتایی ژوورەکانی منداڵان، لەهەر جێگایەکدابن دەبێت چالاکییەکانی ئەوانی تیادا بێتە دی، بەشێوەیەکی گشتی، دەتوانرێت کورسییەکان بەشێوەیەکی نافەرمیی (وەك دانانی کورسییەکانی هۆڵی گەورەکان/ وەرگێڕ) دابنرێن، چونکە منداڵان بەوە دڵشاد دەبن، بەتایبەتیش گەر کورسیی منداڵانەیان لەبری ئەوانەی پشتیان ڕێکە، بۆ دابنرێت.

هەروەها پێویستە جێگاکان بەپێی جۆری چالاکییەکان بۆ تەرخان بکرێت، واتە هەر چالاکییە بەپێی پێویستیی خۆی. گەر چالاکییەکان بەکاری دەستیو کاغەزین بوون، ئەوا دەبێ مێزەکانیان لەوانە بن کە بەزوویی خاوێن دەکرێنەوەو بە پەڕۆی تەڕ

بسـڕدرێنەوە، هەرچـۆن دەبـێ سەرچـاوەی ئاویـان لاوە نزیـك بێـت بـۆ دەستشـتنی منداڵەکانو کارمەندەکان، هاوکات ئەو جێگایانەی نمایشـی فیلمیـان تیـادا دەکرێـت پێویستە تاریك بکرێن، واتە لەکاتی کوژاندنەوەی گڵۆپەکاندا رونـاکی نەیانگرێتـەوە، پێویستیش دەکات لەو جێگایانەدا شوێنی تـەرخان هـەبێت بـۆ پاراسـتنی کەلوپەلـە بەکارهێنراوەکان، وەك ئامێرەکانی نمایشی فیلم.

### مێزەکان

کاتێك مێزی کارمەندان درووست دەکرێت، پێویستە رەچاوی بەرزییەکەی بکرێتو لە ٢٢ تا ٤٥ ئینج بن، هەرچۆن دانـانی هەنـدێ مێـزی بـەرزتر بـۆ کـارکردنی ئـەو کارمەندانەی ئازاری پشتیان هەیە، تا بەپێوە کاری لەسەر بکەن، کارێکی پێویستە.

هەروەها پانیی مێزەکان دەبێ لە ٣٠ ئینج کەمتر نەبن.

### کەلوپەلەکانی بابەتە بیستراو و بینراوەکان

بوونی بابەتی بیستراو و بینـراو لـە کتێبخانـەدا ئـەوە دەخـوازێ کـە کەلوپـەلی پێویست دابین بکرێت بۆ بەکارهێنان لەو بەشـەدا، لەوانـە مێـزی گونجـاو بـۆ دانـانی ئامێرەکان لەسەریان، هەروەها چەند ئامێرێکی وەکو: تۆماری کاسێتە دەنگییـەکانو ئامێری نمایشی فیلمەکان، ئەوانەش بەشێکیان بە پاتری کار دەکەنو بەشـی تریشـیان بەوزەی کارەبا، هەربۆیە دەبێ لە نەخشەسازیی ئەو بەشەدا دانانی جێگاکانیو دانـانی خاڵەکانی کارەبا بەهەند وەربگیرێت وەك پێویست.

**روناكی**

روناكی رۆڵێكی دیاری هەیە، نەك هەر لە نەخشەسازیی كتێبخانەدا، بەڵكو لەپێشكەش كردنی ئەركەكانیشیدا، هەمیشە ئەو نەخشەسازییە بەشێوەیەكە كە كارمەندانی كتێبخانە بەباشی بەكاری بهێننو سوودمەند بن لێی.

روناكی بەتەنیا خزمەتی تەلاری كتێبخانە ناكات، بەڵكو كاریگەریشی دەبێت بۆ سەر هامشۆكەرانی كتێبخانەو وایان لێدەكات هەستێكی باشیان هەبێت بەرامبەر خودی كتێبخانە.

لەدانانی روناكیدا، لەكۆنەوە تا ئەمڕۆ گۆڕان بەسەر روناكیدا هاتووە، دەبینین ئەمڕۆ روناكی بەشێوەیەكە سوودمەندان هاندەدات بۆ هامشۆی كتێبخانەو سوودوەرگرتن لە سەرچاوەكان.

كتێبخانەكان، وەك هەر تەلارێكی تر، لەژێر كاریگەریی مۆدێلە نوێیەكانی دامەزراندنو دانانی روناكیدایە، گڵۆپەكان بەباشترین شێوە روناكی دەبەخشنو هاوكات وزەی كارەبای كەمیشیان دەوێت، زۆرجار گڵۆپەكان بە بنمیچی بەرزەوە جێگیر دەكرێن تاوەكو زۆرترین تیشك دابەش بكەن، لەگەڵ ئەوانەدا رەچاوی نەخشەسازیی سیستمەكانی گەرمكردنەوەو فێنك كردنەوەی كتێبخانە دەكرێت.

لەرابردوودا دانانی روناكی بۆ هۆڵەكانی پاراستنی كتێب گرفتیان لەبەردەمدا بووە، بەڵام ئێستا ئەندازیارە تەلارسازەكانو نەخشەسازەكانی ناوەوەی كتێبخانەو ئەندازیارانی كارەبا پێكەوە پلانی ئەوەیان دارشتووە كە دابەشكردنی روناكی لەو هۆڵانەدا بەشێوەیەك بێت كە سەرجەم دۆڵابو رەفەكانی پاراستنی كتێب دیاربنو روناكی بیانگرێتەوە.

هەرچۆن لەتەلاری کتێبخانەکاندا، بایەخی زۆر دەدرێتە پەنجەرەکان، نەك هەر وەکو سەرچاوەیەکی بینین لەهەردوو دیوی دەرەوەو ناوەوە، بەڵکو وەك هۆکارێ بۆ روناك کردنەوەی زیاتر.

لەئێستادا پانتاییەکی زۆر لە دیوارەکانی کتێبخانە بۆ پەنجەرەو شووشە تەرخان دەکرێت، لەدانانی جۆری شووشەشدا رەچاوی ئەوە دەکرێت کە ئەستووربن‌و نەهێڵن دەنگ بگاتە ناو کتێبخانە.

## ئامێرەکان

بەکارهێنانی ئامێرەکان لەکتێبخانەدا بووەتە کارێکی یەکجار پێویست‌و سەرجەم ئەرکەکانی کتێبخانەو خزمەتگوزارییەکانی کتێبخانە بەهۆی ئامێرەکانەوە رادەپەڕێنرێت، ئەمە بەروونی لە خزمەتگوزاریی کتێبخانە گشتییەکاندا رەنگی داوەتەوە، ئیتر قەوارەی کتێبخانە هەرچەندە بێت‌و سەرەکی بێت یان لاوەکی.

کتێبخانە پێویستی زۆری بەبوونی ئامێرەکانی کۆمپیوتەرە، هاوکات پێویستی بەوەیە بەشداربێت لە سیستمە کۆمپیوتەرییەکاندا بۆ کاری پێڕست‌و خواستن‌و کارە رۆتینییە رۆژانەکانی تر.

ئامێرەکان پێویستیان بەجێگای گونجاوی خۆیان هەیە تا دابنرێن‌و کاریان لەسەر بکرێن، هەروەها دەبێت لەو جێگایانەدا کە دادەنرێن کەشی گونجاو دابین بکرێت، لە سەرچاوەکانی گەرمی‌و ساردیی، هەروەها لەبوونی سەرچاوەکانی وزەی کارەباو هێڵی تەلەفۆنی، دەبێت شاشەی کۆمپیوتەرەکان لە روناکیی راستەوخۆ بپارێزرێن.

هەرچەندە جێگرەوە بۆ پێڕستی کارتەکان داهێنراوەو سوودمەند بەهۆی کۆمپیوتەرەوە مەبەستەکانی دێنێتە دی‌و ئەوەش پانتایی بۆ کتێبخانە گێڕاوەتەوە،

بەڵام پارێزگـاری لـەو جـۆرە پێڕسـتە دەکرێـت تـا بەیـەکجاری دەگۆڕێـت بەشـێوەی کۆمپیوتەری.

ئەم سیستمە نوێیە هەلی باشتر دەرەخسێنێ بۆ خوێنەرانو کارمەندان لەیەك کاتدا کارەکانیـان بەباشـترین شـێوە بـەرن بـەرێوە، هەڵبـەت سـاڵانی ئاینـدە سیسـتمە راستەوخۆکان دەبێتە بنەمای کارو کاروبارەکان خێراترو گونجاوتر بەرێوە دەچن.

بەکارهێنانی سەرچاوەکان وەك ژێدەرو رێبەری ئەلیکترۆنی لەکارەکانی توێژینـەوەو بیبلیۆگرافیادا، وایانکردوە رووبەری گەورەتر تەرخان بکرێت بـۆ خزمەتگوزارییـەکانی ژێدەرو رێبەرەکان.

لەهەندێك لەکتێبخانەکانـدا چـاودێریی سەرچـاوەکانی زانیـاریی جـۆرە کـارێکی تایبەتە، هەربۆیـە پێویسـتی بـە رووبـەرێکی جیـاو داخـراو هەیـە، ئـیتر لەشـوێنی ژێدەرەکاندا بێـت یـان لەشـوێنی کـاری کارمەندانـدا، دیـارە سـوودمەندیش یـاخود راستەوخۆ سوود لەجێگای سەرچاوەکانو سەرچـاوەی مەبەسـتی وەردەگرێـت، یـاخود لەرێی کارمەندی کتێبخانەوە.

هەنـدێك کتێبخانـەی گشـتی چـەند کۆمپیوتـەرێك بـەجیا تـەرخان دەکـەن بـۆ بەکارهێنانی سوودمەندان، بەتایبەت کە ئـەوە بووەتـە خزمەتگوزارییـەکی بـەربڵاوو دەرکەوتووە سوودمەندان حەز بە بـەکارهێنانی کۆمپیوتـەر دەکـەن لـە کتێبخانـەدا، دەتوانرێ کۆمپیوتەرەکان بـەو بەرنامانـە کاربکـەن کـە لەلایـەن کتێبخانـەوە بۆیـان دادەنرێت، یان خودی سوودمەند بۆیان دادەنێن.

بەڵام ئەو کتێبخانانەی بەشداریی دەکەن لەگەڵ دامـەزراوی تـردا لـەرێی ئـامێری کۆمپیوتەری سەرەکییەوە لەناو کتێبخانەدا، ئەوا دەکەوێتـە ژێـر چـاودێریی تـەواوی کتێبخانەکەوە.

هەروەها بـوونی چـەندین هێڵـی تەلـەفۆن لـە کتێبخانـە گشـتییەکاندا کـارێکی پێویسـتە، هەرچـۆن زیـادبوونی بـەکارهێنانی کۆمپیوتەر(ئینتـەرنێت)و فـاکس لـە کتێبخانەدا ئـەوە دەخـوازێ ژمـارەی هێڵـەکانی تەلـەفۆن زیـاتر بکـرێن، پێویسـتە خزمەتگوزاریی تەلەفۆنی لەچەند جێگایەکی جیاوازی ناو کتێبخانەدا بەڕێوەببرێت.

**پارێزگاری لە ئاگر کەوتنەوە**

بوونی ئامێرەکانی ئاگادارکردنـەوەو ئـاگر کوژاندنـەوە لـە کتێبخانـەدا کـارێکی یەکجار پێویستەو نابێ ئەم لایەنە فەرامۆش بکرێت.

لەئێستادا سیستمەکانی فریاکـەوتنی ئـەو حاڵەتـەو پاراسـتنی سەرچـاوەکان لـە سووتانو لەناوچوون بەجۆرێکە کە لە کۆندا وا نەبووەو سیستمی پێشکەوتوو دانراوە بۆ بەرگرتن لەو مەترسییە، کتێبخانەکان لە هەوڵی ئەوەدان لە ئاگرکەوتنەوەدا سیستمی کوژاندنەوە بە گاز بێت نەك بە ئـاو، تـا سەرچـاوەکان خـراپ نـەبن، هەرچـۆن ژووری کۆمپیوتەرەکانو جێگاکانی پاراستنی کتێبە دەگمەنەکان هەستیارانە تـر مامەڵـەیان لەگەڵدا دەکرێت بۆ بەدووربوون لەو مەترسییە.

ڕێکخستنی کتێبخانە گشتییەکانو بەڕێوەبردنیان لە کارە هەرە گرنگەکانن، چونکە ژینگەی کارکردنو باش ڕێکخراو هۆکاری کاریگەرە بۆ ئاکارو هەڵسوکەوتی کارمەندان، ئەوەش بەپیادەکردنی سیاسەتی کارگێڕیو بەڕێوەبردنی کاروبارەکان ئەنجام دەدرێت.

پێویستە بەڕێوەبەرێتی کارایانە زانیارییەکان بخاتە بەردەستو بوار بداتە کارمەندان بەشداریی لە بڕیارەکاندا بکەنو بایەخ بدەنە نوێکردنەوەو داهێنان.

**١- ڕێکخستنی کارگێڕی:**

ژمارەی کارمەندان چەندبنو توانایان هەرچۆنێك بێت، دەبێ ڕێگایەکی دیاریکراو بگرێتەبەر بۆ ڕێکخستنی کاروبارەکان، پێویستە بەلای کەمەوە چوار کارمەند دیاری بکرێت وەك جێگرەوە لەکاتی پێویستدا کارەکان راپەڕێنن.

هەڵبەت ڕێکخستنی کارگێریی هەر کتێبخانەیەکی گشتی بەپێی قەوارەیو ژمارەی سەرچاوەکانیو دابەشکردنی بەشو یەکەکانی دەبێت، ئەوەشە دەبێتە سەرچاوەی بەڕێوەچوونی کارەکانو پەیوەندییەکانی کتێبخانەکە، ئەو ڕێکخستنە لە کتێبخانەدا بەشێوەیەکی سێ کوچکەیی دەبێت، لوتکەی ئەو سێ کوچکەیە بریتی دەبێت لە لیژنەیەك کە رۆڵی راوێژکارانە دەبینێت بۆ بەڕێوەبردنی سیاسەتی کتێبخانەکە، دوای ئەوان بەڕێوەبەری کتێبخانە دێت کە بەرپرسە لە جێبەجێکردنی سیاسەتی کتێبخانەو بەڕێوەبردنی بەشێوەیەکی رۆژانە، هەروەها بەڕێوەبردنی خزمەتگوزارییەکانو چالاکییەکان کە لەکتێبخانەدا ئەنجام دەدرێن، لەگەڵ کاروباری کارمەندانو ئاگاداربوون لە سەرچاوەکانو کەلوپەلەکان.

دەکرێت جێگرێك بۆ بەڕێوەبەر دابنرێت لەگەڵ سکرتاریەت، دیارە ڕێگای باو بۆ ڕێکخستنی کاروبارەکان بەپێی ئەرکی هەریەك لە کارمەندان دەبێت، واتە:




ڕێکخستنی کارگێڕی لە پێکهاتەی کتێبخانەی گشتیدا

هەڵبــژاردنی سەرچــاوەکانو دابینکردنیــان، پێڕســتو پــۆلێن، خزمــەتگوزاریی ژێدەرەکانو زانیارییەکان، خواستنو...تاد، بۆ هەر بەشــەش لێپرســراوێك دادەنرێــتو دەکرێت هەر بەشەش بەسەر چەند لقێکدا دابــەش بکرێــت، ئــەویش بــەپێی سروشــتی کتێبخانەکە (بڕوانە پەیکەری ڕێکخستنی کارگێڕیی بۆ پێکهاتەی کتێبخانە).

لەگەڵ گەورەیی کتێبخانەدا پێویست دەکات بەشو یەکەی تر زیاد بکرێت، ئەویش بۆ بەرژەوەندیی سوودمەندان، وەکو بەشی منداڵان، یان بەشی سەرچــاوەکانی بیســتنو بەوشێوەیە.

هەرچۆن لەکاتی پێویستدا لقی دیکە بۆ کتێبخانەی گشتی دەکرێتەوەو پەیکــەری کارگێڕیی بۆ دادەڕێژرێت، بەڵام ئەو کتێبخانانە بچووك دەبنو پەیکەریان جیاواز دەبێ لە کتێبخانە گەورەو سەرەکییەکان.

**٢- کارمەندان:**

ڕەگەزی مرۆیی لــەگرنگترین ڕەگــەزەکانن بــۆ بــەڕێوەبردنی کتێبخانــەی گشــتی، ســەرکەوتنی کتێبخانــە بەنــدە بــە ژمــارەی پێویســتیی کارمەندانــەوە کــە توانــای بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی کتێبخانەیان هەبێت.

ژمارەی کارمەندانی هەر کتێبخانەیەکی گشتی پەیوەستە بەسێ هۆکارەوە:

١- کۆی دانیشتووانی ئەو ناوچەیەی کتێبخانەکەی تیادا دەبێت.

٢- قەوارەی بەپیرەوەچوون بۆ بەکارهێنانی سەرچاوەکانی کتێبخانە.

٣- فراوانی خزمەتگوزاریی کتێبخانە بۆ خوێنەرانی.

بەپێی پێودانی یەکێتی نێودەوڵەتیی کۆمەڵــەو دامــەزراوە کتێبخانەییــەکان یــەك کارمەند بەشی خزمەتکردنی ٢٥٠٠ هاووڵاتی دەکات، بەڵام لەوڵاتە دواکەوتووەکانــدا

ئەو ڕێژەیـە دەگۆڕدرێـت، چـونکە دانیشـتووان زۆرەو ژمـارەی نەخوێنـدەوار زیـاترەو چالاکیی وایش نانوێنرێت کە هامشۆکەر هانبـدرێت بـۆ چـوونە کتێبخانـە، هەربۆیـە پێشنیاز کراوە یەك کارمەند بۆ خزمەتی ١٠ هەزار هاووڵاتی دابنرێت لە شـارەکانداو یەك کارمەندیش بۆ ٥ هەزار هاووڵاتی لە یەکە کارگێڕییە بچووکەکاندا.

کارمەندی کتێبخانە گشتییەکان بەسەر دوو جۆردا دابەشدەبن:

أ- ئەوانەی دەرچووی زانکۆن لەبواری کتێبخانەکاندا، کە کاروبـاری هونـەریو خزمەتگوزارییە بنچـینەییەکان رادەپـەڕێنن، ئـەویش لـەژێر چـاودێریی بەڕێوەبـەری کتێبخانەدا، کە دەبێت خاوەن خەسڵەتی سەرکردایەتیو بەڕێوەبردن بێت، ئەمە بێجگە لە توانای هونەریی.

ب- گروپی کارمەندە نائامادەکان کە زۆربەیان دەرچووی قۆناغی ناوەندین، ئەوانە کاری یاریـدەدەری رادەپـەڕێنن.. لـەو کتێبخانانـەدا کـە بایـەخ بـە خزمـەتگوزاریی کتێبخانەی منداڵان دەدرێت پێویستە کارمەنـدێك هـەبێت تایبەتمەنـدو شـارەزا لـەو خزمەتگوزارییەدا، بەڕای(ماك کۆلفین) کارمەندی لەو جۆرە بـۆ منـداڵ گـرنگترە لـە کارمەندی کتێبخانەی ئاسایی، چونکە لە دووەمیاندا زۆربەی خوێنەران دەتوانن خۆیان خزمەتی خۆیان بکەن بەباشی هەڵسوکەوت بکەن، بەڵام منداڵان پێویستیان بەکەسێکە یارمەتییان بداتو بەرەو کتێبخانەکە رایانبکێشێتو خۆشەویستی بکات لایان.

بۆچوونێکی تریش هەیە کە داوا دەکات کارمەندی لێزان بۆ کاری دیکەی پسپۆڕیی لە کتێبخانە گشتییەکاندا دابین بکرێت، وەکو کارمەند بۆ بەشـی مێردمنـداڵو لاوان، پسپۆڕی زانیارییەکان، پسپۆڕی بایەتیی سەرچاوەکان، پسپۆڕی کتێبخانەی گەڕۆك.

توێژینەوەیەکی نوێش، باس لە ڕۆڵی کارمەندی کتێبخانەکان دەکات لە گۆڕانکارییەکاندا، کە سێ خاڵن و پێویستە کتێبخانەکان سەرپەرشتی ئەو گۆڕانکارییانە بکەن، ئەوانیش:

١- پێویست بوون بە نەهێشتنی نەخوێندەواریی بواری زانیارییەکان.

٢- گەشەکردنی خێرا لە تەکنەلۆجیادا.

٣- گۆڕان لەخەسڵەتی بەرهەمهێنانی زانیاریدا.

کەوا یەکەمیان خۆی لە کارزانیی بواری ڕێکخستنی زانیارییەکان و گەڕان بەشوێنیاندا دەبینێتەوە، دووەمیشیان لە بەکارهێنانی لێزانانەی ئامرازە ئەلیکترۆنییەکاندا دەبێت، هەروەها ڕێکخستنی سیستمی زانیارییەکان، سێیەمیش باش بەکارهێنانی ئامرازەکانی بڵاوکردنەوە کە لەنێوان تێکست و سەرچاوە دەنگی و وێنەییەکاندان.

پێویستە کارمەندی کتێبخانە پسپۆڕبێ لە بوارەکەیداو بڕوانامەی ئەو بوارەی هەبێت، چ بەکالوریۆس و چ دیبلۆم، لەگەڵ ئەوەشدا مەشق و فێربوونی بەردەوام فاکتەری سەرەکین بۆ پێگەیاندنی کارمەندان.

کردنەوەی خولی تایبەتمەند یەك لە ڕێگاکانە بۆ گەشەی کارمەند، بەڵام دەبێ خولەکان بەباشی ئامادە بکرێن و بەڕێوە ببرێن، تیایاندا نوێترین زانیاریی بە بەشداران بوترێتەوەو ئاگادار بکرێن لە کارکردن لەژێر سایەی ئامرازو میتۆدە تەکنەلۆجییە نوێیەکاندا.

هەرچۆن پێویستە کارمەندی کتێبخانە بەشداربێ لە ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکان و کۆنگرەو سیمینارو وۆرك شۆپە تایبەتەکان بەبواری کارکردنیان. لەگەڵ سەردانی

کتێبخانەکانی وڵاتە پێشکەوتووەکان، لەگەڵ هاندانیان بۆ نووسین لە خولاوەو بڵاوکراوە تایبەتمەنـــدەکانو ئامـــادەکردنی توێژینـــەوەو لێکۆڵینـــەوە لـــەبواری زانیـــاریو کتێبخانەکاندا.

### ٣- ڕێساکانی کارکردن:

کارکردنو پێوانەی خزمەتگوزارییو بەخشش لـە کتێبخانـە گشـتییەکاندا پشـت بەچوار خاڵ دەبەستێت:

### أ- پێوانەی کتێبخانە گشتییەکان Standards:

هــەر پێوانەیەکــە دەبێتــە هەڵســەنگێنەری خزمەتگوزارییــەکانی کتێبخانــەو بەڕێوەچوونی بەرنامەکانی، ئەو پێوانانەش لەلایەن ڕێکخراوی پیشـەیی کتێبخانـەکان یان دامەزراوە حکومییە دیاریکراوەکانەوە دادەڕێژرێنو ڕەنگدانەوە دەبن بۆ داخوازیی نموونەیی لە بەڕێوەچوونی کاروباری کتێبخانەکاندا.

لەو پێوانانەدا بایەخ بەلایەنی ژمارەیی دەدرێت، ئەویش وەك ژمارەی کارمەنـدان، ژمارەی کتێب، ژمارەو قەوارەی بەشە خزمەتگوزارییەکان، هەروەها ئاستی زانیارییـە تۆمارکراوەکان.

ساڵی ١٩٨٦ یەکێتی نێودەوڵەتیی کتێبخانەکان(IFLA) ڕێنمایی بۆ کتێبخانـە گشتییەکان ڕاگەیاندوە کە دەبێ کاری لەسەر بکرێت. هەرچۆن ساڵی ١٩٩٣ کۆمەڵەی کتێبخانە بەریتانییەکان بەڵگەنامەی کتێبخانە گشـتییەکانی ڕاگەیانـدوە کـە تیایـدا ڕێسای کاری کتێبخانەکان دارێژراوە.

**ب-یاساکانی کتێبخانە گشتییەکان** Public Library:

ئەلێکس بۆید لەوتارێکیدا سەبارەت کتێبخانە گشتییەکان ئاماژەی بــەوە کــردوە کە هەر ویلایەتە لە ئەمریکا یاســای کتێبخانــەی گشــتیی خــۆی هەیــە، کــە تیایــدا بنەمای یاسایی دامەزراندنی کتێبخانەکانو بەڕێوەبردنیانو باجەکانیان دیاریکراوە.

ســــــالّی ١٩٥٦ کۆنگرێســــــی ئــــــەمریکی یاســــــای خزمەتگوزارییــــــە کــــــتێبخانــــــەییەکانی ڕاگەیاندوە کە تیایدا پێ لەسەر گەیاندنی کتێبخانە بەناوچە گوندنشینەکان داگیراوە.

**ج-گەلاَڵەنامەی کتێبخانە گشتییەکان** Library Rules:

ئەمیان لەئاستی یاسادانی کتێبخانەکان بەرەو خــوارترە، تیایــدا ژمارەیــەك خــاڵ دیاریکراون کە دەبنە بنەمای کارکردن لە کتێبخانەکاندا، وەك ئەركو پســپۆڕییەکان، بۆ نمونە گەلاَڵەنامەی کتێبخانەی قاهیرە، کە تیایدا باس لــە کارەکــەی ئەنجوومــەنی بەڕێوەبردنو کۆبوونەوەکانی، بەڕێوەبــەرو دەســەلاَتەکانی، بودجــەی کتێبخانــەو..تاد، کراوە.

**د- ڕێبەری کاروباری کتێبخانە**

Policies and procedures:

کە بریتییە لە ڕێبەری کاروبارەکانو ئاڕاستەو سیاسەتی بــەڕێوەبردنی کتێبخانــە، لەگەڵ ڕاهێنانی کارمەندە نوێیەکان.

ئەم ڕێبەرە وەك سەرچاوەی کاری کتێبخانە وایەو وەلاَمی هەر پرسیارێکی تێدایــە سەبارەت کاروبارەکانو یەکەکانی کتێبخانەو پسپۆڕییەکان.

دەبێ لەم ڕێبەرەدا ئەم زانیارییانە هەبێت:

* بەرنامەی هەڵبژاردنی سەرچاوەکان.
* ماف‌و ئەرکی کارمەندان.
* وەرگرتنی دیاریی بۆ کتێبخانە.
* ماوەی خواستن‌و سزای درەنگ گەڕاندنەوەی کتێبەکان.
* سکاڵاکان.
* ئەنجوومەنی کتێبخانە.

**٤- بودجە:**

ئەو بڕە پارەیەیە بۆ کتێبخانە دابین دەکرێت، ئەویش دوای ڕەزامەندیی لەسەر داواکارییەکانی، لەبەرئەوەی خزمەتگوزاریی کتێبخانە گشتییەکان بێ بەرامبەر، هەرچۆن لە بەیاننامەی یۆنسکۆدا هاتووە، کەواتە خزمەتگوزارییەکان بۆ هەموو کەسێك دەبێ بەبێ جیاوازیی تەمەن‌و ڕەگەزو ئایین‌و ڕەگەزنامەو زمان‌و باری کۆمەڵایەتی.

د. اسامة السید محمود لە توێژینەوەیەکیدا سەرچاوەکانی داهاتی کتێبخانە بە دابینکردنی دارایی حکومەت‌و هەر پشتیوانییەکی ترو وەرگرتنی دیارییە چاپکراوەکان دیاری دەکات.

هەرچۆن لە کتێبخانەکاندا بۆ دەوڵەمەندکردنی بودجە سوود لە پارەی دیارییەکانی ئەنجوومەنە ناوچەییەکان‌و بییانییەکان دەبینرێت، لەگەڵ پارەی خزمەتگوزارییەکانی وەك: کردنەوەی خولی تایبەت بە کۆمپیوتەرو وێنەگرتن‌و بەشداریی ساڵانەو بەکارهێنانی توێژینەوەکان لە تۆڕەکانی ئینتەرنێتدا.

لەرووی چارەسەری سەرچاوە کتێبخانەییەکانەوە، دەتوانرێت کارە هونەرییە سەرەکییەکان لە کتێبخانە گشتییەکاندا دابەشبکرێت بەسەر چەند بەشێکی سەرەکیدا، ئەوانیش: سەرچاوە بەدەستهێنراوەکان، پێڕستو پۆلێن، چارەسەری ئەلیکترۆنی، پارێزگاریو بەرگ تێگرتن.

پێویستە کتێبخانە گشتییەکان بەخێرایی کار لەگەڵ کتێبو سەرچاوەکانی تری زانیاریدا بکات، ئەویش بۆ وەڵامدانەوەی خواستی سوودمەندان، هەرچۆن زیادبوونی بەرچاو و گەشەکردنی سیستمی کتێبخانە گشتییەکان بۆ بەکارهێنانی سەرچاوە نوێیەکان کارێکی کردوە بەباشی رۆڵی کتێبخانەی گشتی وەك سەرچاوەی زانیارییەکانو رۆشنبیریو کات بەسەربردنو خۆشبەسەربردن دەربکەوێت.

شتێکی سروشتییە کەوا کتێبخانەی گشتی لە زیادکردنی سەرچاوەی نوێ بۆ کۆمەڵە سەرچاوەکانی تووشی گرفتی تایبەت ببێت، هەرچۆن لەگەڵ دوورخستنەوەی سەرچاوە کۆنو کەم بەکارهێنراوەکاندا تووشی هەمان رەوش دەبێت، کە پێویستە کتێبخانەی گشتی لەم رووەوە بەپێچەوانەی کتێبخانەی نەتەوەییو زانکۆکانەوە سیاسەتو پلانی خۆی هەبێت. هاوکات پێویستە کتێبخانەی گشتی بەشێوەیەکی تایبەت بایەخ بەو میتۆدانە بدات کە لە رێیانەوە سوودمەند بەباشیو ئاسانی دەگەنە سەرچاوەکانی، ئەویش بە بەکارهێنانی میتۆدە هونەرییە کاریگەرەکان.

لەکاتی پلاندانانی سیستمی نەتەوەیی بۆ زانیارییەکان، پێویستە جەخت لەسەر بوونی هاوکاریی توندوتۆڵ بکرێت لە بواری خزمەتگوزارییە هونەرییەکاندا لەنێوان کتێبخانەی گشتی لەلایەكو کتێبخانەی نەتەوەییو کتێبخانەی زانکۆکان لەلایەکی ترەوە، بەجۆرێ میتۆدی کاری بنچینەیی لە گشت کتێبخانەکاندا یەکبخرێن، لەگەڵ

ڕەچاوکردنی پەراوێزێك بۆ کاری جودا لە هەریەك لە کتێبخانەکاندا بەپێی خەسڵەتی خۆیان.

دەکرێت لە کاتی نەخشەدانانو بەڕێوەبردنی خزمەتگوزارییە هونەرییەکاندا لە چوارچێوەی سیستمی کتێبخانەی گشتیدا ڕەچاوی هەندێ پێوانە بکرێت، لەوانە نەسپاردنی هەندێ کاری نووسینگەییو نووسینکاریی بە کارمەندە پسپۆڕەکان، تاوەکو بتوانن کار لە بواری کارە بیبلیۆگرافییەکانو خزمەتگوزاریی سەرچاوەکانو خزمەتی سوودمەندان‌دا بکەن، هەرچۆن پێویستە هانی کارمەندان بدرێت بۆ گۆڕینی هەریەك لە میتۆدەکانی تەکنەلۆجیای زانیارییەکان بۆ میتۆدی تر، بەتایبەت لەکاتی دەرکەوتنی میتۆدی نوێی کاریگەرتردا.

هەرچۆن پێویستە لەسەر کارمەندان بەباشی بەکارهێنانی زانیارییە بیبلیۆگرافییەکان بۆ کۆمەڵە کتێبخانەییەکان بزانن، ئەوانەی بۆ مەبەستی دیاریکراو ئامادەکراون، وەکو بەکارهێنانی (پێڕستی کتێبخانە) لەمەبەستی تردا، وەکو (ڕێکخستنی خواستن، ئامادەکردنی لیستی کتێبو...تاد).

هەروەها پێویستە کارمەندان حەزو دەستپێشخەریو دەسەڵاتیان هەبێت بۆ باشکردنی خزمەتگوزارییە هونەرییەکان لە کتێبخانەدا، ئەویش لەرێی ئەنجامدانی پرۆژەی هاوبەش لەگەڵ دامەزراوەی تردا، وەکو: پرۆگرامەکانی ئاڵوگۆڕی سەرچاوە کتێبخانەییەکان، یان ئامادەکردنی لیستی هاوبەش بۆ خولاوەکان، یان ئەنجامدانی بەدەستخستنی چاپکراو بەشێوەیەکی هەرەوەزیو بەشداریکردن لە سەرچاوەکانداو... تاد، بەوەش تێچووی بەڕێوەبردنی کۆمەڵەی کتێبخانەیی کەمدەکاتو هەر هەمووش بەشدار دەبن لە چنینەوەی بەروبوومی کارەکاندا.

## ١-هەڵبژاردنی سەرچاوەو کەرەستەکان:

پێویستە ئەو کەسەی کە کتێب هەڵدەبژێرێت شارەزایی تەواوی هەبێت لەبواری کارەکەی خۆیدا، هەرچۆن دەبێ زانیاریی هەبێت لەسەر سەرچاوەکانی نێو کتێبخانەکەی، هەروەها چۆنێتیو چەندێتی بەکارهێنانیان لەلایەن سوودمەندانەوە.

پێویستە لە کتێبخانەدا گروپێك هەبن بۆ هەڵبژاردن، چونکە کەسێك بەتەنیا ناتوانێ ژمارەیەکی زۆر سەرچاوە دەستنیشان بکات. پێویستە گروپی هەڵبژاردن ناوبەناو کۆبێتەوەو پلان بۆ کارەکانیان دابنێت. هەرچۆن پێویستە یەکێك لە گروپەکە بەوردی چاو بەکتێبی هەڵبژێردراودا بخشێنێتەوە بەر لە بڕیاردانی کڕینی.

لەهەندێ شوێن ئەو هەلە نارەخسێ تەماشای تەواوی کتێبەکان بکرێت، هەربۆیە پەنا دەبرێتە بەر کورتە نمایشی کتێبەکان، ئەوانەش یان بەسەربەخۆ یان لە گۆڤارە تایبەتمەندەکاندا بڵاودەبنەوە.

گەر جیاوازییەکانی نێوان دوو رێگا (شوێنی ژیانی کارمەند لە وڵاتی خۆی لەگەڵ وڵاتانی تر) زۆربوون، واتە گەر ویسترا (لە شوێنانی تر سەرچاوە هەڵبژێردرێن)، دەبێ رەچاوی هەردوولایەنی جوگرافیو کۆمەڵایەتی کۆمەڵگاکان بکرێت ئینجا کتێب هەڵبژێردرێت.

لەکاتی هەڵبژاردنی سەرچاوە زانستییەکاندا، دەکرێ شارەزایەك لە دەرەوەی لیژنەی هەڵبژاردن هەڵبژێردرێت بۆ راوێژ پێکردن، بەتایبەت کە لە لیژنەکەدا کەسی شارەزای تیا نەبوو لەو جۆرە زانستەدا، دەکرێت رای ئەو شارەزایە بەهەند وەربگیرێت، نەك بڕیاری کۆتاییو بڕیار لەلای لیژنەکە بێت، هەرچۆن دەبێت رای شارەزاکە بە

سەرچاوەکانی کتێبخانەکە بەراورد بکرێت، هەروەها بە قەوارەی خواستی سوودمەندان لەوجۆرە سەرچاوانە.

لەو جێگایانەی (دوور لە پایتەختەکانو شارە گەورەکان) کتێبخانـەی کتێبفرۆشـی گەورەنین، ئەوا پێویستە لیژنەی ناوبراو روو لە کتێبخانەی شارەکان بکەنو ئاگـاداربن چ جۆرە سەرچاوەیەکیان لەلا دەستدەکەوێت.

هەروەها دەبێ زمانی ئاخافتنو نووسین لە هەر جێگایەکدا بەهەنـدوەربگیرێت، تـا لەو جۆرە زمانە ببێتە پێوەر بۆ هەڵبژاردنی سەرچاوەکان.

ئامرازی هەڵبژاردن، بێ لەو بەهەند وەرگرتنانەی باسکران بریتییە لە بەکارهێنانی لیستی ناوی کتێبو لیستی بیبلیۆگرافیاکان، هەروەها پێڕستی بڵاوکەرەوەکان، لەگەڵ بابەتەکانی پڕوپاگەندەو ریکلام کە لەلایەن بەرهەمهێنەرانو دەزگاکانی بڵاوکـەرەوەوە ئەنجام دەدرێت.

زۆربەی بڵاوکەرەوەکان پەنا دەبەنە بەر لیستی خولەکی، کە تیایدا زانیاریی لەسەر چاپکراوەکانیان دەخەنە بەرچاو، واتە سەرچاوە نوێیەکانیان.

بەڵام دەبێ ئەوە بزانرێت کە هەرچی لە لیستەکاندا هەن هـەر هـەموویان بابـەتی دینو دەرخستەی بانگەشەکارانەیان تێدایە بۆ فرۆشتنی سەرچـاوەکان، بـەڵام باشـترین لیست ئەوانەن کە لە خولاوە تایبەتمەندەکاندا بڵاودەکرێنەوە، چونکە زانیاریی وردیـان لەمەڕ سەرچاوە چاپکراوەکان تێدا دەخرێنە روو.

بەڵام بیبلیۆگرافیاو لیستەکانی تر کە لەشێوەی جۆراوجۆردا دەکەونە بەرچـاو وەك پێویستیی دیاریکراون لەبواری بابەتیدا، یان بۆ تەمەنی دیاریکراو لە خوێنەران، یـان

بۆ هەر مەبەستێکی تر، هەندێ لەوانە لە پیشانگاکانی کتێبدا دەخرێنە بەردەست، چونکە بەکارهێنانیان ئاسانەو هامشۆکەری ئەو پیشانگایانە سوودیان لێ وەردەگرن.

بیبلیۆگرافیای تر، زۆربەیان لەلایەن کتێبخانەی کتێبفرۆشییەوە، یان کۆمەڵەو رێکخراوی کارمەندانی کتێبخانەکانەوە ئامادە دەکرێن، ئەوانە بە ئاراستەی دیاریکراو ئامادە کراون، کەواتە مەرج نییە هەموو خواستێکی لیژنەکانی هەڵبژاردنیان تیادا بێتە دی.

لەروویەکی ترەوە، دەکرێ بازرگانانی کتێب کە ناتوانن چی لە گەنجینەکانیاندا هەیە بیخەنە بەردەست کتێبخانەکان، تا لێی هەڵبژێرین، ئەوا دەتوانن لەرێی درووستکردنی پیشانگای بچووکەوە بۆ نمایشی کتێبەکانیان ئەو ئامانجە بێننە دی، باشترین جێگاش بۆ دانانی ئەو پیشانگایانە، یان ئەو کۆمەڵە پیشانگایانە کتێبخانەی نەتەوەیی (نیشتمانی) یان کارگێڕیی ناوەندی کتێبخانە گشتییەکانن.

بەڵام سەرچاوە بڵاوکراوە ناوچەییەکان گرفتیان کەمترەو گەیشتن پێیان ئاسانترەو زانیاریی لەسەر نووسەرانیانو بڵاوکەرەوەکانیان زانراوتر دەبێ، هەر بۆیە ئەمینداری کتێبخانەو لیژنەی هەڵبژاردن پێویستە زانیارییان لەسەر کتێبە چاپکراوە ناوخۆییەکان هەبێت، کڕینی ئەو سەرچاوانە هاندەر دەبن بۆ زۆربوونی دانراو و بەرهەمی نوێو گەرمکردنی بازاڕی چاپەمەنی سەبارەت بە بەرهەمی دیکەو سەرچاوەی دیکەی بێجگە لە کتێب، کە بەهۆی گۆڕانکارییە نوێیەکانەوە بەرهەمدەهێنرێن، وەکو کاسێتو ڤیدۆو وێنەی فۆتۆگرافی، کە خودی کتێبخانە گشتییەکان بەرهەمهێنی ئەو سەرچاوە بیستراوو بینراوانەبن، دیارە تۆمارکردنی چیرۆكو بابەتی فۆلکلۆری کارێکی ئاسانە بۆ کتێبخانە گشتییەکانو کتێبخانەی خوێندنگاکانو منداڵان، ئەوانە هەموو

دەبنەوە سەرچاوە بـۆ پرۆگرامـەکانی کتێبخانـە لەسـەر ئاسـتی ناوچـەیی خۆیانـداو خزمەتکردنی سوودمەندان.

## ٢- پێوانەی چەندێتیی کۆمەڵە سەرچاوەکان:

پێوانەی IFLA (کۆمەڵەی کتێبخانەکانی جیهان) راسپاردەی خۆی بۆ کتێبخانە گشتییەکان سەبارەت کۆی سەرچاوەکانیان (بەسەرچاوەی منداڵانیشەوە) بـەم شـێوەیە گەیاندووە:

" لەکۆمەڵگا بچووکەکاندا، دەبێ هەر کەسە لەناوچەکەی خۆیدا سێ بەرگ کتێبی بەربکەوێت، بەڵام چەندە رێـژەی دانیشـتووان زیـاد بکـات ئـەوا ئـەو ژمارەیـە کـەم دەبێتەوە.

پێوانەی پەسەند دوو بەرگە بۆ هەر کەسێك، بەڵام دوو لەسـەر سـێی ئـەو رێژەیـە دەبێت بۆ منداڵ تەخان بکرێت، منداڵی ژوور ١٤ساڵ لەسەدا ٢٥ تا ٣٠ دانیشتووان پێکدێنن، کاتێك سەرژمێری منداڵ لە ٣٠٪ تێپەڕی کـرد دەبـێ دابینکردنـی کتێـب بۆیان زیاتر بێ، بـەڵام لەوڵاتـە تـازە پێگەیشـتووەکاندا تـا ئێسـتا خزمـەتگوزاریی کتێبخانەیی لەقۆناغی گەشەکردندایە، هەر بۆیە ناتوانرێ رێژەی دابینکردنی کتێب بۆ هاووڵاتیان دیاری بکرێت، بەڵام بێگومان لە کۆمەڵگای بچووکدا رێژەی کتێب کـەمتر دەبێ لەکۆمەڵگا گەورەکان..

بەڵام سەبارەت سەرچاوە بیستراوو بینراوەکان، پێوانەکان ئاماژەیان بۆ گەشەکردنە نوێیـەکانی ئـەو جـۆرە سەرچـاوانە کـردوە، واتـە دەسـتەبەرکردنیان لەکتێبخانـە گشتییەکاندا لەگەشەکردندایە.

بەڵام لە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکاندا بەو جۆرە نییەو ئەو سەرچاوانە زۆر لە بەردەستدا نین، بەڵام کار بۆ گەشەپێدانیان دەکرێت بۆ ئایندەی کتێبخانەکانیان.

لەکتێبخانە گشتییەکاندا کەوا ئەو جۆرە سەرچاوانە بەشێکن لە پێکهاتەکانی، دەبێ کتێبخانەی منداڵان بەشی شێری لەو سەرچاوانە بەرکەوێت.

بەپێی راسپاردەکانی (IFLA):

"پێویستە هەر کتێبخانەیەکی گشتی، خزمەتگوزاریی ئەو جۆرە سەرچاوانە لە بەشەکانی گەورەو منداڵاندا بەرێوە ببات، هەر بۆیە پێویستی بە ئامێرەکانی کارپێکردنی تۆمارکراوەکانو ریکۆردی تۆمارکردنو نمایشی فیلمو شاشەی گوێزراوە، ئامێرەکانی رادیۆو تەلەفزیۆن دەبێت.."

هەروەها وتراوە "دەبێ بەلای کەمەوە ٢٠٠٠ سەرچاوەی لەو جۆرانە بۆ کۆی ٢٠ هەزار کەس دابین بکرێت، ئەوانەش جگە لە فیلمو مۆزیك، تۆماری گوتارو فێربوونی زمان بۆ بچووكو گەورە دەگرنە خۆیان.

**٣-پەرەپێدانی پێکهاتەکانی و گەشەپێدانی سیاسەتی کتێبخانە:**

پێویستە کتێبخانەی گشتی جەخت لەسەر ئەوە بکاتەوە کە داخوازیی سوودمەندانی بێنێتەدی، سیاسەتی پەرەپێدانی بەپێی بڕیاری دەسەڵاتی کتێبخانە دەگۆڕێت، ئاخۆ خواستی زۆرینە دێنێتە دی یان کەمینە، لەو ناوچانەدا کە زۆربەی دانیشتووانی لە دێهاتدان و خوێندەوار رێژەیان کەمە جیاوازە لە ناوچە پیشەسازی و بازرگانییەکان کە رێژەی خوێندەوار تیایاندا زۆرە.

بەڵام ئامانجی گشتی بۆ خزمەتگوزارییەکانی کتێبخانەی گشتی بەشێوەیەکە هەر تاکێك و لەهەر کوێ بێت دەرفەتی وەدەستکەوتنی پێویستییەکانی بۆ بڕەخسێنرێت، هەروەها دەبێ هەڵبژاردنی سەرچاوە کتێبخانەییەکان بەپێی داخوازی ئەو کەسانە بێت.

پێویستە کتێبخانەی گشتی پەیوەندیی بەهێز لەگەڵ هەموو ئەو لایەنانەدا ببەستێت کە سەرچاوە چاپکراوەکان و کەرەستە کتێبخانەییەکان دەخەنە بەردەست، ڕەنگە ئەو لایەنانە زیاتر پەیوەست بن بە کتێبخانەی نەتەوەییەوە، کە بەرپرسە لە تۆمارکردن و پاراستنی بەرهەمی هزریی نەتەوەیی کە لە وڵاتدا بڵاودەبنەوە، هەروەها کتێبخانە زانکۆیی و تایبەتمەندەکان کە بەرپرسان لە دابینکردنی سەرچاوەی فراوان لە بابەتە تایبەتمەندەکاندا.

دەبێ ڕێکخستنی پەیوەندی و پلاندانان لە نێوان هەموو ئەو کتێبخانانە (بە کتێبخانەی قوتابخانەکانیشەوە) بە شێوەیەکی کارا بەڕێوەببرێت، تاوەکو وەڵامی داخوازیی سوودمەندان بۆ هەر زانیارییەك لە جێی خۆیدا بدرێتەوە.

لەگەڵ ئەوەدا کە بەشێك لە خوێندەواران و نەخوێندەوار و هەژار و گوندنیشنیان زۆرینەی دانیشتووانی وڵاتە تازە گەشەکردووەکان پێکدێنن، کەچی کەمترین خزمەتگوزاریی کتێبخانە گشتییەکانیان پێ دەگات، چونکە ئەوەی دەیانەوێ چنگیان ناکەوێت یان ئەوانەی هەژارن کاتیان نییە بۆ سەردانی کتێبخانە، یان نایگەنێ یاخود توانای بەشداریی کردنیان نییە لە کتێبخانەدا، بەتایبەت کە گەلێك لە کتێبخانەکان پشت بە بەشداریی ئەندامان و دیاریی بچووکی ناوچەکانیان دەبەستن، ئەمە جگە لەوەی گوندنشینان لە شوێنی دابڕاودا لە نزیك رووبارو چیاو دارستانەکاندا دەژین و زۆر دوورن لە کتێبخانە گشتییە بچووکەکانی ناوچەکانیانەوە.

پێویستە سیاسەتی پەرەپێدانی سەرچاوە کتێبخانەییەکان بەجۆرێك بێ کە سەرچاوەی خوێندنەوەی هەمەجۆرو سەرچاوە بیستراو و بینراوەکان بۆ ئاستی خوێندەوارانی جیاواز فەراهەم بکرێت، هەرچۆن پێویستە کتێبخانە کاربکات بۆ دابین کردنی سەرچاوە بیستراو و بینراوەکان بەم شێوەیە:

*تۆمارە دەنگییەکانی موزیکی فۆلکلۆری میللی و موزیك و گۆرانیی کۆن و نوێ، گوتار و ئاخافتنی گشتی، خوێندنەوەکان بۆ ئەدەبیاتی نەتەوەیی، بەرنامەکانی فێرکردنی زمان.

*فیلمی رەنگاورەنگ، کە باسی جوگرافیای وڵات و شوێنەوارەکانی و مێژووی سروشتی و مێژووی کۆمەڵایەتی بکەن.

*فیلمی دۆکیۆمێنتی و فێرکاریی.

*بەرنامەکانی رادیۆ و تەلەفزیۆن.

پێویستە زمانە جیاوازەکان لە کتێبخانەدا بخرێنە بەرچاو، بەڵام لەپێشەوە بایەخ بە زمانی نەتەوەیی ئەو وڵاتە بدرێت، هاوکات واز لەو زمانانە بهێنرێت کە کەس تێیان ناگات، پێویستە هەمە چەشنی لە سەرچاوەدا هەبێ و هاوکات چاپکراوانی وڵاتانی دیکە پەیدا بکرێن، لەگەڵ ئەوانەشدا بزانرێ چی لە بازاڕدا هەیەو ئاگاداریی نرخ بکرێت بۆ ئەوانەی کە ناتوانن بە دڵی خۆیان کتێب بکڕن، دەبێ کتێبخانە گشت کتێبە گرانەکان بکڕێت.

پێویستە کتێبخانە ئەو سەرچاوانە دابین بکەن کە جێبایەخی گشتین و خوێنەریان لە هەموو ئاستەکاندا دەبێت، لەگەڵ ئەوانەشدا دەبێ زیاتر بایەخ بە چاپکراوە ناوخۆییەکان بدرێت کە مەبەستی سوودمەندان دەبن، لەگەڵ دابین کردنی بابەتەکانی

کات بەسەربردنو خۆشبەسەربردن، هەر کتێبخانەیەك بەو جۆرە پەرە بەخۆی بدات، گرفتی پشتگیریی دارایی لەلایەن کۆمەڵەوە نابێ، چونکە خەڵکێکی زۆر روو لە کتێبخانە دەکەن و بەشداریی تێدا دەکەن.

**٤-بەشداریی لە سەرچاوەکاندا:**

سیستمی کتێبخانە چەند ساڵێکە لە وڵاتاندا شێوەی جۆراوجۆری لە هاوکاریی بە مەبەستی خواستن لە نێوان کتێبخانەکاندا لە خۆگرتووە، ئەوەش بۆ زۆربوونی سەرچاوەکان و وەڵامدانەوەی خواستی خوێنەران، بواری خزمەتگوزاریی سەرچاوەو زانیارییەکان گرنگترین بواری هاوکاریی نێوان کتێبخانەکانە، چونکە هیچ کتێبخانەیەك توانای نییە بەتەنیا خواستی هامشۆکەرانی بهێنێتە دی، هەموو کتێبخانەکانیش شێوازی جیاواز پەیڕەو دەکەن بۆ بەشداریی لەسەرچاوەکاندا.

ئەزموونەکان سەلماندوویانە کە ئاستەنگیی دارایی لە هۆکارە سەرەکییەکانە بۆ هاندانی هاوکاریی نێوان کتێبخانەکان، بەتایبەت بۆ سەرچاوەکانی زانستە سروشتی و فیزیکییەکان کە گرانترن لە سەرچاوەکانی زانستە مرۆییەکان.

پێویستە دەوڵەت بۆ پەیداکردنی سەرچاوەکان بۆ کتێبخانە گشتییەکان بەشێوەی هاریکاریی ئەم خاڵانەی رەچاو بکات:

*شێوازیی نموونەیی ئەو هاریکارییە لەو کاتانەدا دێتە دی کە لە وڵاتدا کتێبخانەی نەتەوەیی، کۆمەڵەی کتێبخانەکان، خوێندنگای کتێبخانە و تۆڕی کتێبخانەکان هەبن، هەروەها ژمارەیەك لە کارمەندی لێهاتووی بواری کتێبخانە هەبن بۆ راهێنانی کارمەندان، بەر لە دەسپێکردن بە بەرنامەی هاوکاری و هاریکاریی لە سەرچاوەکاندا.

*ئامادەکردنی ئامار سەبارەت هەریەك لە:

-ئەو لایەنانە کە پرۆسەی خوێندن دەرەخسێنن.

-شوێنی کارپێکردن و پاراستنی سەرچاوەکان.

-هەڵبژاردنی شێواز و کارپێکردن لەسەر بەشداریی کردن لە سەرچاوەکاندا.

*دابینکردنی زانیاریی لەسەر سەرچاوەکان لەسەر ئاستی جیهان، دابینکردنی ژمارەیەك لە پێڕست و بیبلیۆگرافیاو رێبەرەکان و نوێکردنەوەیان بەشێوەیەکی دەوریی بەردەوام.

دەکرێ کتێبخانە هاوکارەکان پێکهاتەیەکی کتێبخانەیی دروست بکەن و کتێبخانەی گشتی یان کتێبخانەی نەتەوەیی سەرپەرشتیی کارەکە بکات، تیایدا کتێبخانە بەشدارەکان دیاری بکرێت لەگەڵ دەستنیشانکردنی بەرپرسیاریی هەریەك لە کتێبخانەکان.

ساڵی ١٩٧٦ رێکخراوی IFLA بەپێی بەرنامەیەك ئەوەی دیاری کرد "بەخێرایی وەڵامی پرسیارەکان بدرێتەوە، هاوکات بە خێرایی چاپکراوەکان ئاڵوگۆڕ بکرێن، دەبێ سۆراغی چاپکراوەکان لە کتێبخانە ناوخۆییەکان لە سەرەتادا بکرێت ئینجا لە کتێبخانە نێو دەوڵەتییەکاندا، پێویستە لەهەر وڵاتێکیشدا سەنتەرێ بۆ خواستن دیاری بکرێت".

کتێبخانە بچووکەکان کەمتر داوای ناونیشان و سەرچاوە دەکەن لەچاو کتێبخانە گەورەکاندا، دەتوانرێ هاریکاریی لەنێوان کتێبخانە گشتییەکان و کتێبخانە قوتابخانەییەکاندا بهێنرێتە دی" بەتایبەت بۆ ئاڵوگۆڕی سەرچاوەکانی رۆشنبیریی گشتی و سەرچاوەکانی پرۆگرامەکانی خوێندن، هاوکات ئەو هاوکارییە لەگەڵ

کتێبخانە تایبەتمەندەکاندا بێتە دی، دەبێ کتێبخانەیەکی ناوەندیی ئەرکی پێڕستەکان بگرێتە ئەستۆ، بەپێی ئەو پێڕستە ناوەندییە خواستەکان دەردەکەون. پێڕستەکان بەچاپکراوی دەخرێنە روو، هەروەها لەشێوەی بچووککراوە لەسەر مایکرۆفیش.

هەروەها لیستەی خولاوەکان شێوەیەکن لە پێڕستی یەکگرتوو، چونکە خولاوەکان لە پێشەوەی چاپکراوە داواکراوەکان دەبن سێ پێویستیی زیندوو هەن بۆ بەشداریی لە هاوکاریی سەرچاوەکاندا:

١-سەرچاوەی زانیاریی سوودبەخش بۆ بەشداری پێکردن.

٢-خواستی تەواو بۆ ئیلتیزام لە بەشداریی و هاوکاریی کارا.

٣-میکانیزمی بەکارهێنانی سەرچاوەکان لە کۆمەڵگادا.

دەبێ ئەو میکانیزمە لە دامەزراندنی تۆڕی زانیارییەکاندا بخرێنە کار، بەوەش زانیاریی بیبلیۆگرافی دەخرێنە بەردەستی هەموو لایەك.

**٥-پێڕست و پۆلێن:**

دوای ئەوەی کتێبخانە کەرەستە هەڵبژێردراوەکانی پێدەگات.

وا پێویست دەکات ئامادەکاریی هونەرییانە بۆ سەرچاوەکان بکرێت و کاری پێڕستی پێویستیان بۆ ئەنجام بدرێت، تاوەکو خوێنەران ئاشنابن پێیان و بە باشی پێیان بگەن.

دیارە ئەو ئامادەکارییە سەرەتا بە پێڕستی وەسفی دەسپێدەکات و پاشانیش پۆلێنو پێڕستی بابەتی.

ئاستی وەسفی سەرچاوەکان بەپێی جۆری کتێبخانەکان دەبن، گەورە یـان نـاوەنجی یان بچـووك، هەرچـۆن دەبـێ لەگـەڵ جـۆری کتێبخانەکانیشـدا یـەك بگرنـەوە، وەك کتێبخانەی نەتەوەیی، یان زانکۆیی، یان تایبەتمەند، یان گشتی و ...تاد.

دیارە هەر کتێبخانەیە بەپێی ویستی خۆی جـۆری پێڕسـت هەڵدەبـژێرێ، کـە لـە خزمەتی سوودمەندانیدا بێت.

بـۆ یاریـدەدانی کتێبخانـە گشـتییە بچـووکەکان، یـان کتێبخانـەی منـداڵان و کتێبخانەی قوتابخانەیی، کە یەك ئەمینداری کتێبخانەیان هەیە، چـاپکراوێك بـەناوی (کورتەی بنەماکانی ئەنگلۆ- ئەمریکی بۆ پێڕست کردن) خراوەتـە بەردەسـت کـە بـە کەڵکی ئەو جۆرە کتێبخانانەو ئاستی ساکاری پێڕست کردنیان دێت.

سەبارەت بـە پـۆلێن کـردن، بـەکارهێنانی پـۆلێنی دیـوی دەیـی لـە کتێبخانـە گشتییەکانی زۆربەی وڵاتانی جیهاندا باوە، بەتایبـەت وڵاتـە عەرەبییـەکان، گـەلێك وەرگێڕان لە پۆلێنی دیوی دەیی بۆ عەرەبی کراون، کە تازەترینیان ئـەوەی ڕێکخـراوی یۆنسکۆیە لـە ١٩٩٧دا. هەرچـۆن گـەلێك لیسـتەی سـەبارەت بـە زمـانی عـەرەبی چاپکراون، کە گونجاوترینیان بـۆ کتێبخانـە گشـتییەکانی ئێمـە ئـەوەی (د. شـعبان عبدالعزیز خلیفه)یە.

جاران ئەرکی خزمەتگوزارییە هونەرییەکان بەشێوەی هەوڵی تاکە کەسی لـە هـەر کتێبخانەیەکی گشتیدا ئەنجام دەدرا، بەڵام ئێستا لە زۆربەی وڵاتانـدا بووەتـە ئـەرکی دەستەی ناوەندیی.

کارمەندی کتێبخانەکان و پسپۆڕان ئەم خزمەتگوزارییـە بەشـێوەیەکی ناوەنـدیی ئەنجام دەدەن، بەشێوەیەك کارەکەیان، واتە ئامادەکردنی پێڕست و پۆلێن لە خزمـەتی

سەرجەم ئەو کتێبخانانەدایە کە بەشداران لە سیستەمەکەدا، ئامادەکردنی کارتە چاپکراوەکان یەکێکە لە بەشەکانی کارە هونەرییەکان، تەنانەت دوای بەکارهێنانی کۆمپیوتەرە لە تۆمارکردن و چاپی کارتەکاندا، تا ئێستا زۆرینەی کتێبخانەکان ئەو کارتانە بەکاردێنن، بە تایبەت لە کتێبخانە گشتییە بچووکەکاندا، سەنتەری کارە هونەرییەکان لە کتێبخانە گشتییەکاندا، ئەرك و خزمەتگوزاریی تایبەت پێشکەش دەکەن، لەوانە:

*چارەسەری ناوەندیی بۆ سەرچاوەکان بە پێودانی یەکگرتووەوە.

*پێشکەش کردنی لیستەی سەرچاوە چاپکراوەکان نوێیەکان.

*پێشکەش کردنی زانیاریی سەرەبات ئەو کتێبانەی لە دەرەوەی سیستەمەکەدا دەستدەکەون.

*ئامادەکردنی راپۆرتی دەوری بۆ هەریەك لە کتێبخانە هاوکارەکان، تیایدا تێچووەکان دیاری دەکرێن و بەسەر سەرچاوە بەدەست گەیشتووەکاندا دابەش دەکرێن.

*ئامادەکردنی ئاماری ساڵانە سەبارەت تێچووی کتێبەکان و کەرەستە کتێبخانەییەکانی تر، لەگەڵ ژمارەی گۆڤارەکان و ژمارەی ناونیشانە کڕاوەکان لە هەر جۆرێك لەجۆری چاپکراوەکان.

بەپێی هەموو ئەوانە، تۆمار ئامادە دەکرێ بۆ ئاسانکاریی کە هەر کتێبخانەیەك بتوانێ:

-کتێب و سەرچاوە کتێبخانەیە دابینکراوەکان دیاری بکات.

-سەرلەنوێ رێکخستنەوەو ریزبەندیی جێگای کتێبەکان بەپێی سیستمی تایبەت بەو کتێبخانەیە .

-گواستنەوەی کتێبە هەڵگیراوەکان بۆ گەنجینەی ناوەندیی، یان بۆ کتێبخانەی تر.

بەپێی سیستمی هەر کتێبخانەیەکی گشتی، لەهەر وڵاتێکدا بێ، دەتوانرێ ئامادەکردنی لیستی بیبلیۆگرافی نەتەوەیی بۆ سەرچاوەکانی هەر وڵاتە ئامادە بکرێت، کە دەبێ ئەو ئەرکە کتێبخانەی نەتەوەیی رایپەڕێنێ، بەڵام لە نەبوونی ئەو کتێبخانەیەدا، ئەوا کتێبخانەی گشتی ئەو ئەرکە دەگرێتە ئەستۆ.

سەبارەت بە ئامادەکردنی دەروازەی وەسفی یان بابەتی، ئەوا سوودی دەبێ بۆ کتێبخانەی وڵاتانی دیکە تا دەروازە بە ناوی کەسان و دەستەکان ئامادە بکەن، هەر بەو هۆیەشەوە پێداویستی ناوچەیی و نەتەوەیی بۆ سەرچاوەکان دەردەکەوێت، لەگەڵ دیاریکردنی بەرهەمی هزریی تایبەت بەهەر وڵاتێك، گەر لە دەرەوەی خۆشیدا بەکارنەیەت.

**٦- بە ئەلیکترۆنی کردنی کارە هونەرییەکان:**

بە ئەلیکترۆنی کردن ئاراستەیەکی گشتییە لە سەرجەم کتێبخانەکاندا، بە کتێبخانە گشتییەکانیشەوە، ئەم ئاراستەیە بە پێی قەوارەی کتێبخانەو ئەرکە تایبەتەکانی شێوەی جیا لەخۆدەگرێت، بێگومان ئەم پرۆسەیە لە کتێبخانەیەکی بچووکی ناوچەیەکی گوندنشیندا جێبەجێ ناکرێت، بەڵام بۆ کتێبخانەی گەورەی ناوچەیەکی پیشەسازیی دەگونجێت، بە ئەلیکترۆنی کردنی لە کارە هونەرییەکانی: خواستن، خزمەتگوزارییە هونەرییەکان و تەنانەت لە کاری ژێدەرەکاندا بەکاردێت.

کتێبخانە، بە پێی سیستمێك لەنێو خودی کتێبخانەدا ئەم پرۆسەیە دەبات بەڕێوە، یاخود بە بەستنەوەی بە سیستمێکەوە کە لە دەرەوەی کتێبخانە لایەنێکی دیکە بیبات بەڕێوە. لە حاڵەتی یەکەمدا کتێبخانە بەرپرسیاریی تەواو لە ئەستۆ دەگرێت بۆ

پراکتیزەکردنی سیستمەکە (نەخشەسازیی، دابینکردنی سەرجەم ئامێر و پرۆگرامەکان، چاککردنەوە، بەکارهێنان)، ئەمە لە کاتێکدا دێتە دیی کە کتێبخانەکە گەورە بێت و بتوانێ بەپێی توانا دارایی و مرۆییەکانی ئەو ئەرکانە ببات بەڕێوە، لەم کاتەشدا سیستمی خواستنی ئامادە بە هۆی کۆمپیوتەرەکانەوە پیادە دەکرێت.

بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا کتێبخانە دەبەسترێتەوە بە کۆمپیوتەرێکەوە کە لە جێگایەکی تردایە، لەوێدا کارەکان لەرێی هێڵەکانی پەیوەندییەوە دەچن بەڕێوە، نموونەی ئەم حاڵەتە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە کتێبخانە گشتییەکاندا زۆرە کە بەستراونەتەوە بە سیستمی OCLC لە پێناوی چارەسەری هونەریدا، لەوێ بەرلەوەی پێڕستکار پێڕستی کتێبێك بکات، تەماشا دەکات، گەر لەوەوبەر پێڕست کرابوو، داوای کارتەکانی پێڕست دەکات لەگەڵ کارتی لێواری کتێب و ئەوا لەرێی پۆستی ئاساییەوە پێی دەگات، بەڵام گەر نەکرابوو ئەوا دەبێت کارتی پێڕستی ئەو کتێبە ئامادە بکات و زانیاریی تەواو بخاتە نێو سیستمەکەوە، بەو جۆرە زانیاریی تەواو دەخاتە بەردەستی هەموو ئەو کتێبخانانەی لە سیستمەکەدان.

هەرچۆن سیستمی دیکە هەن کە کتێبخانە دەتوانێ بەکاریان بهێنێت، وەك هێنانەوە بەردەستی زانیاریی و بەدەستهێنانی وەڵام بۆ هەر پرسیارێ کە لەسەر روانگەی زانیارییەکانی نێو کۆمپیوتەرەکاندا هەبن، ئەم سیستمە بە تایبەت لە خزمەتی ئەو سوودمەندانەدا دەبێ کە خەریکی توێژینەوەن.

بە ئەلیکترۆنی کردن تێچووی زۆرەو پێویستی بە ئامادەکردن و پراکتیزەکردنی وردە، هەربۆیە کارمەندی کتێبخانە دەبێ یەکەمجار جەخت لەوە بکاتەوە کە زانیارییەکان بۆ سوودمەندان پێویستن و بە زۆربوونی فشار لەسەر کتێبخانەکەی

ئەو شێوازە دەبێتە پێداویستیی گرنگ، دەبێ ئەوەش لەبەرچاو بگیرێت کە لە کاتی ئەو پرۆسەیەدا ئاستەنگ دێتە ڕێگای کارکردن، هەرچۆن دەبێ ئەوەش بزانرێت لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا بە ئەلیکترۆنی کردن تێچوونی کەم دەبێتەوە، لەگەڵ زیادبوونی تواناداو ئاسان بوونی هەنگاوەکانی کارپێکردن، بە زۆربوونی ڕێگاکانی بەکارهێنانی کۆمپیوتەرەکانیشەوە.

**٧-پوختەکردن و لابردن:**

سەرچاوەکانی کتێبخانە هەمیشە بەکەڵك نامێنن، ئیتر سەرچاوەی خوێنەری گەورە یان منداڵان بن، پێداچوونەوەی سەرچاوەکان بۆ لابردنی ئەوانەی گونجاون نامێنن بەرامبەر بە گرنگیی هەڵبژاردنی سەرچاوەی نوێ و زیاد خستنەسەر کتێبخانە، دەبێ لە کاتی لابردنی سەرچاوەکاندا سێ شت لەبەرچاو بگیرێت، دروستیی زانیارییەکان و بەردەوامیی بەکارهێنان و حاڵەتی دارایی.

بێجگە لە کتێب، سەرچاوەکانی تر بەپێی گۆڕانکاریی بەردەوامە ئەگەری دوورخستنەوەیان زیاترە، کتێبیش لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا بایەخی کاتی بڵاوکردنەوەی لە دەستدەدات، هەربۆیە پشکنینی ناوبەناو بە کتێبی ناو تاخچنەکاندا پێویستە، بۆ دوورخستنەوەی کۆنەکان و دابینکردنی سەرچاوەی نوێ لە جێگایاندا، ئیتر بە چاپی نوێیانەوە بێ یان بە ناونیشانی دیکەی جێگرەوەیان.

هەندێ کتێب دوای ماوەیەك بەهای خۆی لە دەستدەدات، ئەویش لەبەر کەم بوونەوەی بایەخی بابەتەکەی، هەرچۆن ئاراستەکانی نووسینی ئەو بابەتانە شتی نوێیان تێدەکەوێت، ئەگەر کتێبخانەش گرفتی جێگای هەبوو، ئەوا ئەو جۆرە کتێبانە جێگای لێ دەگرن، ئەگەر جێگاشی زۆر بوو پێویست ناکات سەرچاوەی بێ کەڵکی تیادا بێت.

ئەو سەرچاوە لابراوانە یان بە یەکجاری دووردەخـــــرێنەوە، یـان لەسـەر تاخچـنەکان لادەبـرێن و دەخرێنــە گەنجینــەی داخــراوەوە، دوورخســتنەوەی یــەکجاری بــۆ ئــەو سەرچاوانەیە کە هەرگیز بەکار ناهێنرێنەوە، هەر بۆیە کتێبخانە خۆی رزگـار دەکـات لێیان، بەڵام لابردنیان لەسەر تاخچنەکان (رەفە کراوەکان) لەبەر ئەوەیە کە بە هــەمان رێژەی جاران بەکار ناهێنرێن، جێگای تاخچنەکانیش دیاریکراوەو بۆ ئەوەی سەرچاوەی نوێ بێتە جێگایان، دەخرێنە گەنجینەوە، بەڵام دەبێ گەنجینە داخراوەکانیش گـەرمی و ساردییان و تیشکیان گونجاو بێ، هەروەها تاخچینان تێدا بێ بۆ پاراستنی کتێبەکان.

بوکلاند Buckland ئاماژە بە هەندێ لە هۆکارەکانی لابردنی کتێب دەکـات، لەوانە تێچووی دانانی کتێبی زۆر لە تاخچن و دۆڵابەکاندا.

کارمەندی کتێبخانە بەهۆی سـێ هۆکـارەوە پرۆسـەی لابـردن و دوورخسـتنەوەی کتێبەکان ئەنجام دەدات:

١-سنووردارییی خزمەتگوزاریی خواستن لەنێو کتێبخانەدا.

٢-رووبەری تاخچنە کراوەو بەردەستەکانە.

٣-ئامانجەکانی کتێبخانە.

یەکەمیان گرنگیــی پارســەنگ راگـرتن لــە نێــو کـڕین و خواسـتندا، دەبـێ ئـەو سەرچاوانە بپارێزێت کە ئەگەری سوود لێ وەرگرتنەوەیان دەبێت، بەڵام ئەوانەی تر کە سوودیان نەمێنێت ئەوا بە کتێبی نوێ جێگایان دەگیرێتەوە.

دووەمیــان قــەوارەی کــاری دوورخســتنەوە بەنــد دەبــێ بــە رووبــەری تاخچــنە بەردەستەکانەوە، ئەو کتێبخانەیەی تاخچنەکانی دیاریکراو بێ دەبێ هاتنی سەرچاوەی نوێ لەبەرچاو بگرێت.

سێیەمیشیان کە پەیوەستە بە ئامانجی کتێبخانەوە، کە ئەوانیش پەیوەندییان بە جۆری کتێبخانەکانەوە هەیە، بۆ نموونە کتێبخانە گشتییەکان بە بەردەوامی لە نوێبوونەوەدان، کۆی دوورخراوەکان پەیوەندیی بە سەرچاوە نوێیەکانەوە هەیە، ئەوانەی دووریش دەخرێنەوە دووبارە لە خزمەتی کتێبخانە گشتییەکانی تردا دەبن لەکاتی داواکردنیاندا.

پێویستە ئەو سەرچاوانەی بە زۆری بەکاردێن بگۆڕێن بە چاپی نوێتر، یان بەرگیان تێ بگیرێت، یان کتێبی جێگیرەوە (ئەلتەرناتیف) یان بۆ دابنرێت.

**٨-چاککردنەوەو بەرگ تێگرتن:**

کتێب و سەرچاوەی کتێبخانەییەکانی تر ئەگەری دڕان و پوانیان هەیە، ئەگەر کتێبخانە بە شێوەیەکی بەردەوام پیایاندا نەچێتەوە، ئەوا ئەو سەرچاوانە وردە وردە فەرامۆش دەکرێن و لەبەرچاو دەکەون و ئەبێزرێن، سوودمەندیش هیچ بایەخێکیان بۆ دانانێت، هەر بەو چاوەشەوە دەڕواننە تەواوی سەرچاوەکانی کتێبخانە.

ئاڕاستەیەك لە کارکردندا هەیە بۆ چاککردنەوەی ئەو جۆرە سەرچاوانە، ئیتر چەندیشی تێبچێت گرنگ نییە، دیارە ئەو ئاڕاستەیە گونجاو نییە، بەڵام ئەگەر پشکنینی ناوە ناوە بۆ سەرچاوەکان بکرێت ئەوا بە چاککردنەوەی کەم سەرچاوەکان لەبار دەبنەوە بۆ بەکارهێنان، ئەگەر خەوشی کتێبەکان کەم بوون، وەك دڕانی لاپەڕەیەك، یان لێبوونەوەی ئەوا دەتوانرێ لەناو کتێبخانەدا چاك بکرێتەوە، یان لێبوونەوەی بەرگەکان، ئەوانیش چارەسەریان هەیە، بەڵام گەر کتێبێك هەڵوەشابێ، ئەوا دەبێ سەر لە نوێ بەرگی تێبگیرێتەوە، بەڵام دەبێ تێچووی ئەو بەرگ تێگرتنەوە بەراورد بکرێت لەگەڵ چەندێتی بەکارهێنانی ئەو سەرچاوەیەدا، گەر

تێچووی زۆربێ ئەوا باشتر وایە کتێبێکی تر لە هەمان ناونیشان، یان چاپێکی تازەتری دابین بکرێت.

بەرگی کتێبە چاپکراوەکان بەو شێوەیە درووست نەکراوە کە بە کەڵکی بەکارهێنان بێن لە کتێبخانەکاندا، یەك دوو ساڵ دوای کڕینیان دەپوێن و کاڵ دەبنەوەو خراپ دەبن، هەر بۆیە پێویستە ئەو کتێبانە هەڵبژێردرێن کەوا لە بەرگ گیراون، هەرچەندە شێوەیان وەك بەرگی ئاسایی سەرنج راکێش نین.

خزمەتگوزاریی بەرگ تێگرتن لە دیارترین چالاکییەکانی کتێبخانە گشتییەکانە لە زۆربەی وڵاتاندا، دەبێ جۆری سەرچاوەکەو بەکارهێنانی لە کتێبخانەدا بەهەند وەربگیرێت بۆ بڕیاری بەرگ تێگرتنیان.

دەبێ کتێبخانە لیستێکی بیبلیۆگرافی بە دوو نوسخە بۆ ئەو کتێبانە ئامادە بکات کە دەنێردرێن بۆ بەرگ تێگرتن، نوسخەیەکیان لەگەڵ کتێبەکاندا دەنێردرێت و ئەوەی تریان دادەنرێن بۆ بەراورد لە کاتی گەڕاندنەوەی کتێبە بەرگ تێگیراوەکاندا، هەروەها پێویستە بە چەند جارێك کتێبەکان بنێردرێن بۆ بەرگ تێگرتن، تا تاخچنەکان چۆڵ نەبن لە کتێب، چونکە سوودمەندان داوایان دەکەن.

ئاشکرایە خزمەتگوزاری و چالاکییەکان دوا وێنەی کتێبخانەن، واتە ڕەوشی بەڕێوەچوونی کتێبخانە نیشاندەدەن، بەواتایەکی تر بەرهەمی ڕاستەقینەی کتێبخانەن کە لە دوای هەوڵێکی زۆر دەچنرێنەوە.

کتێبخانەی گشتی گەر خاوەنی تەلارێکی جوان بێت لە شوێنێکی دیارداو گونجاو بێ بۆ بینینی ڕۆڵی خۆی لە کۆمەڵگادا، هاوکات باشترین کۆمەڵە سەرچاوە گرنگەکانی لەڕووی چەندێتی و چۆنێتییەوە لەخۆگرتبێت و پڕیشی بێ لە چاپکراوەکان و لەڕووی هونەرکاریشەوە ئەو سەرچاوانە بە باشترین شێوە ئامادەکرابن، هەر هەموو ئەوانە مەبەست ناپێکن ئەگەر کتێبخانە لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری و چالاکییەکاندا ڕۆڵی بەرچاو نەبینێت، بەڵام دەبێ ئەو چالاکییانە بەشێوەیەك بن خواستی خەڵکە سوودمەندەکە بهێننەدی.

پێویستە کتێبخانەی گشتی داخوازی هەموو جۆرە خەڵکی لە دانیشتووانی ئەو ناوچەیە بهێنێتە دی کە کتێبخانەکەی تێدا دەبێت، فراوانبوونی بازنەی خزمەتگوزارییەکانی کتێبخانەش بەندە بە بوونی سەرچاوەی دارایی و ئەو پشتیوانییەی کە میری لە کتێبخانەکانی دەکات، لەگەڵ هەر کۆمەکێ کە دەسەڵاتە ناوچەییەکان لە کتێبخانەی سنووری خۆیانی دەکەن، لەو کاتانەشدا کە ژمارەی سوودمەندانی کتێبخانە لە کۆمەڵگادا روو لە زیادبوون دەبن، پێویستە بیر لە خزمەتگوزاریی نوێ بکرێتەوە بۆ کتێبخانەکان.

### ١-خواستن:

خزمەتگوزاریی خواستنی دەرەکی، بە گرنگترین کۆنترین خزمەتگوزارییەك دادەنرێت کە لەلایەن کتێبخانە گشتییەکانەوە پێشکەشکراوە. خزمەتگوزاریی خواستنی دەرەکی لەبەر چەند هۆکارێك هاتووەتە ئارا، لەوانە بەرتەسکیی جێگا لەناو کتێبخانەدا کە بوار نارەخسێ بۆ هەموو سوودمەندان تا خوێندنەوەی ناوخۆیی لەنێو خودی کتێبخانەکەدا ئەنجام بدەن، بە تایبەت لە کاتە هەستیارو پێویستەکاندا، رووبەری کتێبخانە هەرچەند بێت کاریگەریی رووبەری دیاریکراو بۆ خوێندنەوەی ناوخۆیی لەسەر دەبێت، ئەمەش کار دەکاتە سەر سەرجەم چالاکییەکانی تری کتێبخانە، بە تایبەت لەو کتێبخانانەدا کە ژمارەی هامشۆکەرو سوودمەندانی روو لە زیادبوون دەبن.

هەروەها هەندێك لە سوودمەندان دەیانەوێ، سەرچاوەکان ببەنە دەرەوەی کتێبخانە، ئیتر لەبەر نەگونجانی کاتەکانی کردنەوەی کتێبخانە بێت لەگەڵ رەوشی خۆیاندا، یان لەبەر پێویستیی بەکارهێنانی سەرچاوەکان لە شوێنی کارەکانیدا، لەگەڵ هۆکاری تری پەیوەست بە خودی سوودمەندانەوە وەك خوێندنەوە لە رەوشێکی ئارام و هێمندا لەماڵەوە.

بۆ ئەوەی کتێبخانەی گشتی بتوانێ بە باشترین شێوە ئەم خزمەتگوزارییە جێبەجێ بکات، دەبێ ژمارەی پێویست لەسەرچاوەکان دابین بکات تاوەکو داواکاریی و پێویستیی سوودمەندان بهێنێتە دی، پێویستە کارمەندانی بەشی سەرچاوە بەدەستهاتووەکان (التزوید) بە باشی بزانن ئەو سەرچاوانە کامانەن کە داوای خواستنی

دەرەکییان لەسەرە، تاوەکو کتێبخانە ژمارەو دانەی پێویست دابین بکات، بەڵام کتێبخانە ناتوانێ لەو سەرچاوانەی کە نرخیان گرانە زیاتر لە دانەیەك دابین بکات، هەروەها لە کۆمەڵەی ژێدەرو خولاوەکان، هەر بۆیە ئەو جۆرە سەرچاوانە ناخرێتە خزمەت خواستنی دەرەکی و تەنیا بەهۆی وێنەگرتنەوەی لاپەڕە داوا لەسەرەکانیانەوە سوودمەند دەتوانێ کاری خۆی مەیسەر بکات.

هەندێ لە کتێبخانەکان لایان باشە ئەو سەرچاوانەی دەخرێنە خزمەتگوزاریی خواستنەوە بەجیا دابنرێن، هەشیانە کۆمەڵە سەرچاوەی خواستن جیا دەکاتەوە بۆ خزمەتگوزاریی خواستن لەگەڵ کتێبخانەکانی تردا، نەوەك سوودمەنداندا بە راستەوخۆیی، لە کاتێکدا سوودمەندان لە رێی کتێبخانەی دووەمەوە داخوازیی خواستن بۆ سەرچاوەیەك پێشکەش بکات، ئەوا لە کتێبخانەی یەکەم داوا دەکرێ، ئەمیش ئەگەر سەرچاوەکە لاپەڕەکانی زۆربێت ئەوا وەك خواستن بۆیان دەنێرێ بۆ ماوەی دیاریکراو و ئەگەر لاپەڕەکانیشی کەم بێت ئەوا بە وێنە لەبەرگیراوی دەینێرێ بۆ کتێبخانەی دووەم، بەڵام لە هەر دوو حاڵەتدا سوودمەندان کرێی گواستنەوەو لەبەرگرتنەوەی دەکەوێتە ئەستۆ.

جاران خواستنی دەرەکی تەنیا بۆ کتێب بوو، بەڵام تێڕوانین بۆ ئەم خزمەتگوزارییە تەواو گۆڕراوە، دەبینین لە ئێستادا کتێبخانە گشتییەکان زۆربەی سەرچاوە کتێبخانەییەکان دەخاتە خزمەتی خواستنی دەرەکییەوە، ئێستا خواستنی سەرچاوە دەنگی و رەنگییەکان لە خزمەتی سوودمەندان، بەتایبەت سوودمەندە بە تەمەنەکان کە ناتوانن شوێنی نیشتەجێبوونیان جێبهێڵن و زوو زوو سەردانی کتێبخانە بکەن، هەرچۆن هەندێ کتێبخانە لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا وانەی لەبەرگیراوی تابلۆ

هونەرییە ئەسڵییەکان بۆ ماوەی دیاریکراو دەخەنە خزمەتگوزاریی خواستنی دەرەکییەوە.

هاوکات ئەم جۆرە خواستنە بە تەنیا بۆ تاکەکان نییەو بەڵکو بۆ دەستەو ڕێکخراوەکانیشە، ئێستا بووەتە دیاردەو کتێبخانە بەشێك لە سەرچاوەکانی بە خواستن دەداتە خوێندنگاو یانەکان و خانەی سەرپەرشتیی پیران، ئەمە بێجگە لە هەندێ دامەزراوی دیکەی خزمەتگوزاریی گشتی.

کۆمەڵە سەرچاوەکان کە بۆ خزمەتگوزاریی خواستنی دەرەکی دادەنرێن ناوە دەگۆڕدرێن بە بابەتی تر، ئەویش بە پێی خواست و داواکاریی سوودمەندان.

هەروەها لە وڵاتانی پێشکەوتوودا هاوکاریی لە نێوان کتێبخانەی گشتی و خوێندنگاکاندا بە باشترین شێوە دەکرێت ئەویش بە خواستنی دەرەکی بۆ سەرچاوەکان و ئەو کەرەستانەی کە مامۆستایان وەك بابەتی فێرکردن بۆ بەرژەوەندیی خوێندکاران بەکاری دێنن، خواستنی ئەو سەرچاوانە بۆ وەرزێك یان ساڵێك دەبێ و بە پێی پێویست و سیستمی وانە و پرۆگرامی پەیوەست بە بەکارهێنانی سەرچاوەکانەوە.

**٢-خزمەتگوزاریی ژێدەرو زانیارییەکان:**

پێویستە لە کتێبخانە گشتییەکاندا خزمەتگوزارییەکانی ژێدەر (المراجع) لەگەڵ ئەو گەشەکردنە زۆرەدا بڕوات بەڕێوە کە لە بەرهەمهێنانی سەرچاوەکانی زانیاریدا هاتووەتە دی، ئیتر لە رووی چەندایەتییەوە بێت یاخود لە رووی چۆنایەتی و بابەتییەوە، چونکە شێوازە تەقلیدییەکان لە خزمەتگوزاریی ژێدەردا لە توانایدا نەماوە خواستی سوودمەندان جێبەجێ بکات و هاوسەنگیی نێوان خزمەتگوزارییە بەردەستەکەو داواکارییەکان لەسەر ئەو خزمەتگوزارییە رابگرێت، هەرچۆن لە

تواناشیدا نەماوە لە کۆمەڵگای نوێدا و بە پێی خواستی سوودمەندان گەشــە بــەخۆی بدات.

لە کارە سەرەکییەکان بۆ پێشکەکردنی ئەم خزمەتگوزارییە لە کتێبخانەی گشتیدا کردنەوەی بەشی سەربەخۆیە بەخۆی، هەروەها دانانی بەرپرسێك بۆ ئەو بەشە کـە لــە توانایدا بێ بەباشی و تەواویی خزمەتگوزاریی ژێدەر و خزمــەتگوزاریی زانیارییــەکان پێشکەش بکات. دەبێ ئەو بەرپرسە پسپۆڕە ژێــدەرو سەرچــاوەکانی بەشــەکەی بخاتــە بەردەستی سوودمەندان و هاوکات هەر شــتێکی تــر کــە لــە کتێبخانەکەیــدا دەســت نەکەوێ ئەوا بۆ دابینکردنیان پەنا بەرێتە بەر کتێبخانەکانی تر، هەرچۆن بــۆی هەیــە هەندێ سەرچاوەی کتێبخانەیی تر لە کــارگێڕیی ناوەنــدیی بخــوازێ، ئــەو کارگێڕییــە سەرەکییەی کتێبخانەکەی بەستراوە پێیەوە، یان لە کتێبخانەی ناوەندیی شارەکەیان و تەنانەت لە کتێبخانەی نەتەوەیی وڵاتەکــەیان، ئــەویش لــەرێی کــارگێڕیی ناوەنــدی و کتێبخانەی ناوەندییەوە.

دەبێ کۆمەڵەی ژێدەرو زانیارییەکان لە کتێبخانەی گشتیدا، کەتەلۆکی بازرگانی و راپۆرتی کۆمپانیاکانیش بگرێتەخۆ، هەروەها دەبێ لەو بەشــەدا لیســتی یــەکگرتووی سەرچاوەکانی کتێبخانە گشتییەکانی تر لە بەردەستدا بێ، لەگەڵ زانیــاریی ســەبارەت چۆنێتی بەدەستخستنیان، ئیتر لەرێی خواستنی نێوان کتێبخانەکانەوە بێت، یان لەرێی لە بەرگرتنەوەی ئەو ژێدەرو سەرچاوانەوە کە تواناى خواستنیان نییە.

پێویستە کتێبخانە جەخت لەسەر دانانی ئەو سەرچاوانە بکاتــەوە کــە زانیارییــان تیایە لەمەڕ خزمەتگوزاریی ژێدەریی لە کتێبخانە گشتییەکاندا، ئەوانیش بریتیین لــە چاپکراوە حکومەتییەکان کە سیمای ناوچەیی و هەرێمی و نەتەوەیی و نێو دەوڵەتی ـ

یان هەیە، هەروەها ئەو سەرچاوانەی زانیارییان تێدایە لەسەر مێژووی ناوچەکە، کە بریتیین لە وێنە و نەخشە و دیاریکردنی جێگایەکانی ئەو ناوچەیە.

هەرچۆن دەبێ خزمەتگوزارییەکانی وێنەگرتن و لەبەرگرتنەوە لەبەر دەستدا بن، تا توێژەران بتوانن بە خێرایی دانەیەك بۆ خۆیان لەو سەرچاوانە دابین بکەن کە کەم و دەگمەنن، هەرچۆن لەبەرگرتنەوەی خێرایی سەرچاوەکان کات دەگێڕێتەوە بۆ توێژەران، ئەمە جگە لەوەی دەکرێ لەڕێی تەلەفۆنەوە و بەخێرایی هەندێ زانیاریی لەو بەشە بە تەلەفۆن وەربگیرێت، ئەوەش کە بەو شێوەیە نەدرێ ئەوا دەکرێ لەڕێی پۆستەوە بگەێنرێت، یان داوا لە سوودمەند بکرێت خۆی سەردانی کتێبخانە بکات بۆ وەرگرتنی سەرچاوەو زانیارییەکان لە کاتی پێویستدا.

### ٣-خزمەتگوزاریی سەرچاوە بیستراو و بینراوەکان:

سەرچاوە بیستراو و بینراوەکان، هەر وەك سەرچاوەی زانیارییەکانی تر، تۆمارن بۆ زانیارییە مرۆیی و دەستکەوتە کۆمەڵایەتی و زانستی و هونەرییەکان، ئەو سەرچاوانە تەواوی زانیارییەکان بە رێگایەك دەخەنە بەرچاو کە لەگەڵ خۆیاندا چێژ بەخش دەبن بە سوودمەند و زۆرجار کاریگەرتریش دەبن لە سەرچاوە چاپکراوەکان، هەر بۆیە دەبینین بەکارهێنانی ئەم جۆرە سەرچاوانە بەشێوەیەکی بەردەوام داخوازییان لەسەرە، بەو پێیەش کۆمەڵەی تۆمارە دەنگییەکان و فیلمەکان رۆژ لە دوای رۆژ ژمارەیان لەنێو سەرچاوەکاندا بەرەو زیادبوون دەڕوات و بە سەرچاوەی بنچینەیی ناودێر دەکرێن، کەواتە دەبێ وەك خزمەتگوزارییەك لە خزمەتی گەورەو لاو و منداڵاندا بن.

پێویستە لە کاتی دارشتنی سیستمی کتێبخانەی گشتیدا جێگایەك بۆ سەرچاوە بیستراو و بینراوەکان دابین بکرێت و پارێزگارییان لێ بکرێت، هەروەك سەرچاوەکانی

خوێندنەوەی تەقلیدی (کتێبی کاغەزین)، ئەو سەرچاوانە پێویستیان بە ئامێرە بۆ بەکارهێنانیان، ئامێرەکانیش پێویستیان بە پارێزگاری و چاودێری و چاککردنەوەیە بەشێوەیەکی بەردەوام، ئەوانە پێویستیان بە چاککردنەوە هەیە بە پێچەوانەی سەرچاوە تەقلیدییەکان کە کتێب و گۆڤار و رۆژنامەکانن، هەر چۆن هەڵبژاردنی کۆمەڵە سەرچاوەکانی بیستراو و بینراو تا رادەیەکی زۆر لە وڵاتە تازە پێشکەوتووەکاندا کارێکی ئاڵۆزە، ئەویش بە هۆی نەبوونی توانای ناسینی سەرچاوەکان بەر لە کڕینیانەوەیە، بەڵام لە وڵاتانی پێشکەوتوودا ئەم جۆرە سەرچاوانە بە بڕی یەکجار زۆر بەرهەم دەهێنرێن، ئەوەش دەرفەتی هەڵبژاردن فراوان دەکات، بە پێچەوانەی وڵاتە تازە پێشکەوتووەکانەوە کەوا سەرچاوەی لەو جۆرە تەنیا لە چوارچێوەی بابەتە زمانەوانی و رۆشنبیرییە سنووردارەکاندا، هەربۆیە هەڵبژاردن دەبێتە کارێکی قورس و ئاڵۆز!

دەکرێ هەر کتێبخانەیەك بۆ کڕینی سەرچاوە بیستراو و بینراوەکان پشت بەو پێودانە ببەستێ کە لە کاتی هەڵبژاردن و کڕینی کتێبدا پەیڕەوی دەکات، پێویستە هەڵبژاردنی ئەو سەرچاوانە بەو پەڕی بایەخەوە بێت، چونکە تێچووی زۆریان دەوێ، چ لە کڕینیاندا یان لە چاککردنەوەی ئامێرەکانی کارپێکردنیاندا، دەبێ بۆ کڕینیان لیستی سەرەکیی هەڵبژاردن بەکاربهێنرێ، هەروەها نمایشە بڵاوکراوەکان و رێبەرەکان لە رۆژنامەکاندا، کە تایبەت دەبن بەو سەرچاوانە.

موزیکە تۆمارکراوەکان و نمایشە دراميیەکان و جۆرەکانی تری هونەرە جوانەکان، لە بابەتە هەرە پێویستەکانن وەك کەرەستەیەك بۆ ناو هەر کتێبخانەیەك، بە تایبەت ئەگەر ژمارەی نمایشەکان و بابەتە هونەرییەکان کەم بن و سنووری چالاکییەکانیشیان دیاریکراو بن، هەڵبەت بە تەنیا نمایشیان لە تەلەفزیۆن و رادیۆکانەوە مەبەستی تەواو

ناپێکێ، هەر بۆیە پێویستە کتێبخانە ئەو نمایشە مۆزیکی و هونەرییانە بخاتە بەردەست، بەو پێیەی کتێبخانە ناوەندێکی کلتوورییە و دەبێ هەموو شێوەکانی چالاکی رۆشنبیریی تیادا کۆبێتەوە.

پێویستە لە کتێبخانەی گشتیدا تومارێك هەبێت بۆ تیانووسی موزیکی کلاسیکی ولاتانی رۆژئاوا، یان عەرەبی و ئەفریقی، ئەویش بە بەراودرد بەو ژینگەیەی کتێبخانەکەی تیادا دەبێ، هەروەها پێویستە ئەو سەرچاوە بیستراو، بینراوانە گوزارشت لە ماوەی زەمەنی جیاواز بکەن، هەروەها لە جیاوازیی فۆرم و ولاتان و ئامێرو هونەرمەندو ئاواز دانەرەکان، هاوکات دەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکرێتەوە کەوا موزیکە تۆمارکراوەکان جێبایەخی ناوچەیی و هەرێمین.

**٤-خزمەتگوزاریی لاوان و گەورەکان:**

لە سیستمی کتێبخانەییدا، خواستنی کتێب و سەرچاوە کتێبخانەییەکانی تر بۆ سوود لێوەرگرتنییان لە ماڵەوە، ئەرکی سەرەکیی هەر کتێبخانەیەکی گشتییە، بەڵام ئەمە لە خراپی نیشتەجێبوون، چونکە بچووکی و تەنگی ماڵەکان رێگر دەبن لە رەخساندنی هەلی لەبار بۆ خوێندنەوە لە ماڵەوەدا، لەو کاتانەدا پێویستە کتێبخانە جێگای شیاو لەسەر رووبەری گونجاو بۆ لاوان و گەورەکان دابین بکات تا بەباشی تیایدا بخوێننەوەو شوێنەکە وەها بێ چالاکیی جۆراوجۆری بە مەبەستی (فێرکردنی بەردەوام) تیا بنوێنرێت وەکو گفتوگۆ و دیدار و نمایشی فیلم و...تاد.

مەبەستی سەرەکیی لە پشت خزمەتگوزاریی کتێبخانەیی بۆ گەورە و لاوان، رەخساندنی دەرفەتە بۆ گەیشتن بەو سەرچاوانەی بە رێگای تر پێیان ناگەن، هەر بۆیە دەبێ جەخت لەسەر خستنە بەردەستی بێ بەرامبەری سەرچاوەکان بکرێت بە بێ هیچ

تێچووی پارەیەك لەلایەن سوودمەندانەوە، لەگەڵ کارکردن بۆ دەرفەتدان بە سوودمەند کە بەنێو سەرچاوەکاندا بگەڕێ و بابەتی دڵخوازی خۆی هەڵبژێرێت، لە ئێستادا لە زۆر وڵات حکومەت هەلی لەباری رەخساندوە بۆ خستنە بەردەستی بێ بەرامبەری سەرچاوەکان بۆ هەمووان، بەڵام لەو وڵاتانەدا کە سیستمی کتێبخانەی خوێندنگاکانی تیادا دامەزراوە، ئەوا پەیڕەوکردنی ئەو سیستمانە بۆ کتێبخانە گشتییەکانیان ئاسان دەبێ، چونکە منداڵان دەبنە خاوەن ئەزموون و هەندێ شارەزا بۆ خواستنی کتێب بە مەبەستی خوێندنەوەیان لە ماڵەوە، تەنانەت دەتوانن ئەوانە پێشتر بگێڕنەوەو لە بری ئەوان سەرچاوەی تر بۆ سوود وەرگرتن بخوازن، هەر ئەو منداڵانەن کە دەبنە بەشێکی زۆر لەوانەی داهاتوو هامشۆی کتێبخانەی گشتی دەکەن، بگرە لە تەمەنی لاوێتییەوە تا گەورەبوونیان هەمیشە کتێبخانە بەکاردێنن.

پێویستە پلان هەبێ بۆ لاوان و گەورەکان لە کتێبخانەی گشتیدا، ئەوەش بە هاوکاریی لەگەڵ دامەزراوەکانی تری کۆمەڵگا، بە تایبەت ئەوانەی لە بوارە خزمەتگوزاری و رۆشنبیرییەکاندا کار دەکەن.

دەبێ بەشی خوێنەرە گەورەکان لە کتێبخانەدا سەرچاوەی زۆری بۆ خواستنی دەرەکی و کارە ژێدەرییەکان و چاپکراوە حکومەتییەکان و خولاوەکان دابین بکات، هەرچۆن دەبێ کتێبخانەی گشتی پرۆگرامی پێشکەشکردنی بابەتە بەزمەساتەکانی هەبێ، لەگەڵ بەرنامەی زانیارییەکان لە بابەتی جیاوازدا، ئەمە بێجگە لە نمایشی موزیك و دیالۆژ و گفتوگۆ سەبارەت بابەتەکانی وەکو بەڕێوەبردنی ماڵ و گەشە بەخۆدان و ژیانی خێزانی و کشتوکاڵ و هونەرە جوانەکان و پیشەی دەست و...تاد، هەرچۆن پێویستیشە لە کتێبخانەدا هۆڵی کۆبوونەوە و سیمینارەکان هەبێ بۆ

بەڕێوەبردنی بەرنامەی تایبەت بە گەورەکان، هاوکات دەبێ پێشوازیی لە هەر پێشنیازێك بکرێ کە هەر کەسێك سەبارەت بەرایی کردنی ئەو بەرنامانە پێشکەشی بکەن.

خزمەتگوزارییەکی گرنگی دیکەی کتێبخانە هەیە بۆ تەمەنە گەورەکان، ئەویش تایبەتە بە سوودمەندان لە کەمینە ئیتیکییەکان و زمانەکانی تر کە لەو ناوچەیەدا دەژین کەوا کتێبخانەکەی تێدایە، ئەوانەی ماڵئاواییان لە ژینگەی خۆیان کردوە و هاتوونەتە نێو کۆمەڵگایەکی نامۆ و ژیانێکی نوێوە، دەبێ کتێبخانە سەرچاوەی باش بە زمانەکانی ئەوان دابین بکات، هەروەها بەرنامە ڕێژی بکات بۆ پێشکەشکردنیان بەو کۆمەڵگا نوێیەی تیایدا دەژین، لەگەڵ ناساندنی چالاکییان بە خەڵکی.

زۆر پێویستە بەشی لاوان لە کتێبخانەی گشتییدا داخوازیی خوێنەرە مێرمنداڵەکان دابین بکات لە کتێب و سەرچاوە کتێبخانەییەکانی تر کە سەرنج ڕاکێش بن لایان، وەکو گەشەدان بە خود و پیشەمەندی و وەرزش و ئارەزووەکان و سەرچاوەی تری پەیوەست بە ژیانی گەنجانی بچووکتر لە ٢٠ساڵان، هەر لەوێوە مێرمنداڵەکان ئاشنا دەکرێن بە سەرچاوەکانی بەشی گەورەکان.

هەروەها دەبێ بەشی لاوان بەرنامەی خۆشبەسەربردنی هەبێ وەك دیدار و دیالۆژ، نمایشی فیلم، سەردان بۆ ئەو جێگایانەی جێبایەخیانە، ئەوەش بە پێکهێنانی لیژنەی تایبەت بۆ سەرپەرشتیی چالاکییەکان، لە کاتی بەرنامە ڕیژیدا بۆ خوێنەرە لاوەکان، دەبێ رەچاوی چەند ئامانجێك بکرێ، لەوانە:

-کتێبخانە بە جۆرێك لێ بکرێن کە پێشوازیی باش لە خوێنەران بکات.

-ڕاکێشانی کەسانی دیکە، کە تا ئەو کاتە سوودمەند نەبوون لە کتێبخانە بۆ سەردانی کتێبخانە.

-زیادکردنی بەکارهێنانی سەرچاوەکانی کتێبخانە لەڕێی چالاکییە کتێبخانەییەکانی وەك: پێشانگاکانی کتێب، ئامادەکردنی لیستە بیبلیۆگرافیاکانەوە، لێدوان لەسەر کتێب.

-هاندانی گەشەکردنی زیرەکی و داهێنان و گوزارشت لەخود لەنێو مێردمنداڵاندا لەڕێی بەشداری پێکردنیان لە بەرنامە هەمەرەنگەکانەوە.

-بایەخدانی زیاتر بە کتێبخانە و زۆرتر بەکارهێنانی وەك دامەزراوێکی پەروەردەیی و ڕۆشنبیری.

-پەیوەندیی گرتن لە نێوان کتێبخانە و گروپە لاوەکان و ڕێکخراوەکانی نێو کۆمەڵگا و هاندانی بەرنامەی هاوبەش لە نێوانیاندا.

**٥- خزمەتگوزاریی منداڵان:**

کتێبخانەی گشتی مێژوویەکی دوور و درێژی هەیە لە بواری گشتییەوە منداڵ بەشێکی سەرەکییە لە کۆمەڵگا، هەر بۆیە هەوڵی هاوبەشی هەبووە لەگەڵ ئەو ڕێکخراوە گرنگانەی لە کۆمەڵدا لە پێناوی منداڵاندا کاردەکەن.

بەشی منداڵان لە کتێبخانەی گشتییدا لە پێشەوەی ئەو بەشانەیە کە تیایدا دادەمەزرێ، بەر لە بەشەکانی سوودمەندە گەورەو لاوەکان دادەمەزرێ، لە جیهاندا وڵات نییە کە ئەو بایەخەی لەلا نەبێت و کتێبخانەی منداڵان درووست نەکات، سەدان هەزار لە خەڵکی کار دەکەن بۆ ئەوەی خوێندنەوە بکەنە کلتورێك لە نێو لاوانی دوارۆژدا.

پێویستە پەیوەندیی لە نێوان قوتابخانە و سیستمی خزمەتگوزاریی منداڵان لە کتێبخانەی گشتییدا توندوتۆڵ بێت، ئەو خزمەتگوزارییە پێویستی بە کەسانێکە لەرووی پیشەمەندییەوە راهێنراوبن و لە چالاکییەکانی تایبەت بە منداڵاندا شارەزا بن، وەکو خوێندنەوەی چیرۆك بۆ منداڵان، کارکردن لەگەڵ منداڵە کەمئەندامەکاندا، سازکردنی پێشبڕکێ بۆ خوێندنەوەی شیعر و نیگار کێشان، گەشەپێدانی بەهرەی منداڵان لە کارە دەستییەکاندا، فێربوونی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر، نمایشی شانۆگەریی و بەشداریی لە شانۆی بووکەڵەدا...تاد.

بۆ هاندانی منداڵان تاوەکو رووبکەنە نووسین، دەکرێ دەوڵەت پێشبڕکێ بۆ منداڵە بە تواناکان ساز بکات و لە بەرهەمی خۆیان بە کورتە چیرۆك بەشداریی بکەن، دەکرێت بەرهەمە خەڵاتکراوەکان لە گۆڤاری تایبەت بە منداڵاندا بڵاوبکرێتەوە، سروشتی نافەرمیی بەشی منداڵان لە کتێبخانەی گشتییدا رێگا خۆشکەر دەبێ بۆ ئەنجامدانی ئەو جۆرە چالاکییانە کە کاریگەرییان دەبێ بۆ باشکردنی ئاکار و هەڵسوکەوتی منداڵان و بەهێز بوونی ویستەکانیان و داهێنان و فراوانبوونی ئەندێشەیان.

دەبێ هاوکاری هەبێ لە نێوان کتێبخانەی گشتیی و پسپۆڕاندا و سەبارەت بە چالاکیی منداڵ پرسیاریان پێ بکرێت، لەوانەش بۆ دەوڵەمەند کردنی سەرچاوەکانی منداڵان لە کتێبخانەدا دیسانەوە پرس بەوان بکرێت، هاوکات دەبێت مەشق بەو کارمەندانە بکرێت کە لە کتێبخانەی منداڵان و چالاکییەکانی ئەواندا کار دەکەن، هەرچۆن دەبێ بەوردی بودجە بۆ دابینکردنی سەرچاوەکانی منداڵان دابین بکرێت و ئەو بودجەیە بە باشی خەرج بکرێت.

هەرچەندە سیستمی خوێندن و فێرکردنی منداڵان بەشێوەیەکی گشتگیرە و منداڵان دەخوێنن و کتێبی مندڵانیش یەکجار زۆرن، بەڵام زۆر لە منداڵان لە ماڵەوە کتێبیان نییە، هەر بۆیە دەبێ کتێبخانەی گشتی ڕێگا خۆشبکات بۆیان تا بخوێننەوەو زانیارییەکانیان فراوان بکەن، گەر ئەوە هاتە دی، ئەوا خزمەتێکی مەزن بە کۆمەڵگا دەگەیەنرێت و واشدەکرێت بەردەوام و بۆ ساڵانی داهاتووش ئەو منداڵانە بخوێننەوە.

هەندێك لە ئەمینداری کتێبخانەکان پێیان وایە کە منداڵان نابێ لە ساڵانی یەکەمیان، بەر لە چوونە قوتابخانە هامشۆی کتێبخانە بکەن و سەرچاوەکانی بەکاربهێنن، بەڵام ئەم بۆ چوونە هەڵەیە، چونکە بایەخی منداڵان لە تەمەنی بچووکیانەوە دەستپێدەکات و فێربوونی بەکارهێنانی کتێبخانەش لەلایەن ئەوانەوە بەر لە چوونە قوتابخانە بێت، کارێکی باشە و هەر کە تەماشای وشە نووسراوەکان دەکات بەختەوەر دەبێت و هەوڵی بەزۆر لێ تێگەیشتنییان دەدات.

ئەو منداڵانەی کە توانای بەکارهێنانی کتێبخانەیان هەیە، ئەوا دەبێ هەوڵبدرێت ئەو بەکارهێنانەیان لەلا زیاد بکرێت، بە تایبەت ئەوەی کەزۆریان لا پەسندە خوێندنەوەی چیرۆکەکە بۆیان، هەر بۆیە دەبێ سەعاتەکانی چیرۆك خوێندنەوەیان بۆ زیاد بکرێت، پێویستە ئەو کەسەی کە چیرۆك دەخوێنێتەوەو دەگێڕێتەوە خاوەنی تواناو ژیری بێت و لەگەڵ ئەو چیرۆکەدا بژی کە بۆیان دەگێڕێتەوە، هەر چۆن دەبێ پەلە نەکات و لە کاتی پێویستیدا بەشداری بە منداڵەکان بکات و پرسیاریان لەسەر چیرۆکەکە لێ بکات، ئەمینداری کتێبخانەی منداڵان دەتوانێ چیرۆکەکانیان بۆ کورت بکاتەوە و جاری تر خۆی بۆیان بگێڕێتەوە، لەو کاتەشدا دەتوانرێ گوزارشتی زیاتر و جۆرە نواندنێك لە کاتی گێڕانەوەکەدا بکرێت و جوولەی زیاتری لەگەڵدا نیشانبدرێت،

گەر ئەمینداری کتێبخانە ئەو تواناییانەی تیا نەبوو ئەوە دەکرێ کارمەندی تری بەشەکە بە بەهرەمەندیی خۆیانەوە ئەو ئەرکە جێبەجێ بکەن. هەر لەم بەشەدا گوتار و وانەو نمایشی فیلم وا لە منداڵ دەکەن بە قووڵیی زیاترەوە روو لە خوێندنەوە بکەن، هەر چۆن پێشبڕکێ و بەرنامەکانی خوێندنەوە هانی زیاتری منداڵ دەدەن بۆ خوێندنەوەی ئامانجدار.

لە پشووەکانیشدا دەتوانرێ کتێبخانەی گەڕۆك و ئوتومبیلی گوازەرەوەی کتێب بەکاربهێنرێت.

کارێکی زەحمەتە بۆ کارمەندی کتێبخانە بگاتە ئەو منداڵانەی کە هەرگیز هامشۆی کتێبخانەییان نەکردووە، ئەویش بە هۆی بێبایەخی خێزانەکانیەنەوە بووبێت زیاتر لە منداڵەکان خۆیان بۆ بەکارهێنانی کتێب و کتێبخانە، چونکە تا ئەمڕۆ بەشێك لەو باوکان لایان وایە کە منداڵ نابێ کتێب بەکاربهێنێت تا ئەو کاتەی دەوامی قوتابخانە دەکرێتەوە!

تەنانەت لایان وایە کتێبخانە شتێکی ئەوتۆی تیا نییە تا بە کەڵکی منداڵەکانیان بێت!!

چ بەر لە چوونە قوتابخانە و چ دوای ئەوەش، هەر چەندە توانای پێشوەخت لای منداڵ و ناسینی پیتەکانی نووسین لە نێو کتێبە چاپکراوەکاندا بەر لە فێربوونی منداڵ لە قوتابخانەدا بە ماوەیەکی زۆر، دەبێتە هاندانی منداڵ بۆ گرنگیدان بە لاپەڕەی چاپکراوی نێو کتێبەکانی قوتابخانە و لە ناخیاندا حەزی خوێندنەوە دەچێنرێت، هەر چۆن دەزانن پەیوەندیی نێوان وێنەی نێو کتێبەکان و شتەکانی دەورو بەریان بدۆزنەوە.

هەرچۆن بەکارهێنانی کتێب فێریان دەکات چـۆن لاپـەڕە هەڵبدەنـەوەو بـە باشـی سەرنج بدەن. لێرەوە دەپرسین، ئاخۆ کتێبخانەی گشتی چۆن دەتوانێ ئەو پەیامـە بـەو باوکانە بگەیێنێ کە بایەخی ئەوتۆیان نییە؟!

یەکێك لەو ڕێگایانە بـەهۆی پۆسـتەر و بڵاوکـراوەوە دەبێـت کـە لـە کلینیـك و مەڵبەندی تەندروستی و دایەنگاو باخچەکانی ساوایان هەڵدەواسرێن، یان لـەرێی ئـەو دامەزراو و ڕێکخراوانەوە کـە پەیوەنـدیی نزیکیـان بـە منداڵانـەوە هەیـە، هەنـدێك کتێبخانە هەن کۆمەڵە کتێب بە خواستن دەدەنە باخچەی ساوایان و دایەنگاکان، لەگەڵ ژمارەی زیاتردا بۆیان تا لە ماڵەکانیاندا بۆیان بەکاربهێنن، لەگـەڵ ئەوەشـدا دەکـرێ کارمەندی کتێبخانە پەنا بباتـە بـەر دایکـان و باوکـان و کارمەنـدی تەندروسـتی و سەرپەشتیاری کۆمەڵایەتیی باخچەکان و قوتابخانـەکان تـا خوێندنـەوە لـەلای منـداڵ شیرین بکـەن، هەرچـۆن کتێبخانـەی منـداڵان پێویسـتە ئاگـاداری هـەموو میتـۆدە نوێیەکان بێت کە تایبەت دەبن بە گۆڕانکاریی لەو بوارانەدا.

### ٦- خزمەتگوزاریی لەگەڵ قوتابخانەکان:

لە کۆنـەوە ڕۆڵـی کتێبخانـەی قوتابخانـەکان لـە نێـو قوتابخانـەو خوێندنگاکانـدا دەرکەوتووەو بە زۆریی ئەم جۆرە کتێبخانەیە لەلایەن بەڕێوەبردنی ناوەندیی دامەزراوە پەروەردەییەکـەوە بـەڕێوە دەبرێـت، ئـەویش بـۆ دڵنیـابوون لـە هاوشـێوەیی ئـەو خزمەتگوزارییە لە سەرجەم قوتابخانەکاندا بۆ مامۆستاکان یاخود بۆ قوتابییەکان.

کتێبخانـەی قوتابخانـە بەشـێکی گرنگـە لـە پێکهاتـەی سـەرەکیی سیسـتمی کتێبخانەکان لە هەر وڵاتێکدا و پێویسـتە بـە پـلان و بـەڕێوەبردنی کارامـە بکرێتـە ئامانجێکی بایەخدار لە سیاسەتی نەتەوەیی پەروەردەدا، هەربۆیـە دەبـێ کتێبخانـەی

گشتی ڕەچاوی پەیوەندیی توندوتۆڵ بکات لەگەڵ کتێبخانەی قوتابخانەکاندا و زۆر چالاکیی هاوبەش پێکەوە بنوێنن.

لە زۆر وڵاتدا کتێبخانەی گشتی خزمەتی قوتابخانەکانی بۆ ساڵانێکی زۆر کردوە، وەك وڵاتی دانیمارك، کە سەرپەرشتیی کتێبخانەی قوتابخانەکان لە لایەن کتێبخانەی گشتییەوە کراوە، بەڵام دوای گۆڕانکارییەکان لە میتۆد و شێوازە پەروەردەییەکاندا، کتێبخانەی قوتابخانەکان لە سیستمی کتێبخانەی گشتی دوورخراونەتەوەو لەسەر بنەمایەکی سەربەخۆ خراونەتە گەڕ، بەڵام زۆرجار کاروباریان ئاڵۆز بووە، لە هەندێ وڵاتی تردا کتێبخانەی نەتەوەیی ئەرکی دابینکردنی کتێبی بۆ هەردوو کتێبخانەی قوتابخانەیی و کتێبخانەی گشتیی لە ئەستۆ گرتووە.

پێویستە هاریکاریی لە نێوان هەردوو کتێبخانەی گشتی و قوتابخانەیی لە کۆمەڵێك بواردا هەبێت، لەوانە:

ئامادەکاریی بۆ کردنەوەی خولی کورت بۆ مامۆستا و وانەبێژانی بواری کتێبخانە، پێشکەشکردنی ڕێنمایی و ڕاوێژ بۆ مامۆستا و کارمەندانی بواری کتێبخانەی قوتابخانەیی، پێڕست و پۆلێن و چاککردنەوەی سەرچاوەکان( کتێبەکان)، هەرچۆن پێویستە کارمەندی بەشی منداڵان لە کتێبخانەی گشتی هاوکاریی کتێبخانەی قوتابخانەیی بکات لە ڕووی خستنە بەردەستی کۆمەڵە سەرچاوە بەدەستهاتووەکان و سەردانکردنی هەردوو لا بۆ لای یەکتر.

زۆر لە کتێبخانە گشتییەکان کۆمەڵە سەرچاوەی خوێندنەوە وەك پشتگیرییەك دەخەنە خزمەت کتێبخانەی قوتابخانەکان و پێشکەشەشیان دەکەن، هاوکات گەلێ سەرچاوەی تر وەك خواستن دەدەن پێیان، بۆ ماوەی دیاریکراو، ئەوەش کەموکوڕیی

نەبوونی سەرچاوەکان لەلایان پڕ دەکاتەوە، سەرکەوتنی ئەو جۆرە هاوکارییە پەیوەستە بە ئامانجی مامۆستاکان و توانایی بەڕێوەبەری قوتابخانەو کارمەندان و بەڕێوەبردنی ناوچەیی قوتابخانەکانەوە.

کارمەندی کتێبخانە لە قوتابخانەکاندا دەبنە هاندەر بۆ برەودان بە خوێندنەوەی قوتابیان، بە تایبەت ئەوانەی لە ماڵەکانیاندا هاندانی باشیان نییە بۆ خوێندنەوە، هەرچۆن قوتابخانە ڕێگایەکە بۆ گەیشتن بە هەموو قوتابییەك، لە نەژادو نەتەوەی جیاواز.

ئەو جۆرە ئازادییەی کتێبخانەی منداڵان دەیبەخشێ، لە کتێبخانەی قوتابخانەدا بەو جۆرە نییە، ئەویش لەبەر وابەستەبوون بە سیستمی خوێندنی فەرمییەوە، هەر ئەو ئازادییەشە وا دەکات منداڵان زیاتر ڕووبکەنە بەشی منداڵان لە کتێبخانە گشتییەکان، کەواتە پێویستە کارمەندانی کتێبخانەی قوتابخانەیی جۆرە پەیوەندییەك لە نێوان قوتابخانەو کتێبخانەی گشتیی ناوچەی خۆجێی دروست بکەن، بەوەش پەیوەندیی لە نێوان ئەمینداری کتێبخانەی منداڵان و قوتابی و مامۆستایاندا دروست دەبێ، بەوەش چەندین هەنگاو لە نێوان ئەوانەی لەوەبەر کتێبخانەیان بەکارهێناوە بۆ کتێبخانەکان نزیك بوونەوە ڕوودەدات.

### ٧- خزمەتگوزاریی تازە خوێنەرەکان و ناوچەی گوندنشینەکان:

ئەرکی کتێبخانەی گشتییە بەردەوام ڕۆڵی زیندوو ببینێت لە پشتیوانی و بڵاوکردنەوەی پەروەردەی بەردەوامدا، بە تایبەت لەگەڵ تازە خوێنەرە گەورەکاندا، هەربۆیە دەبێ کتێبخانە پێویستیی ئەو توێژە بەر لەوانی تر لە بەرچاو بگرێت، بە

تایبەت لەو ولاتانەدا کە بەرنامەی خوێندنی گەورەکان لە پێنـاوی فێربـوونی پیشـەی نوێدا، پیادە دەکەن.

لەگـەڵ سـازانی شـێوازی ژیـانی نـوێ و گونجـان لەگـەڵ رەوشـە رۆشـنبیری و کۆمەلایەتییە نوێیەکاندا، هەرچۆن سیستمی کتێبخانەی گشتی رۆڵی گـەورە دەبینـێ لـەو ولاتانـەدا کـە لـە هـەوڵی بەرزکردنـەوەی ئاسـتی فێربوونـدان لـە نێـو هاوولاتییەکانیاندا.

یەکێك لە خزمەتگوزارییەکانی کتێبخانەی گشتی بۆ خوێنەرە نوێیەکانی، شارەزا کردنیانە بە چالاکیی پراکتیکی و کارزانیی پەیوەست بە ژیانی رۆژانەیانـە، هەرچـۆن پێشکەشـکردنی خزمەتگوزاریی کتێبخانەیی بە تازە خوێنەرەکانی ناوچە گوندنشینەکان بایەخی گەورەی خـۆی هەیە، چونکە خەڵکێکی زۆر لە گوندە تەریك و دوورە دەستەکاندا دەژین، ئەوەش بەشێکە لە سیاسەت و پلانی درێژخایەنی حکومەتەکان، بە مەبەستی گەشەپێدان، هاوکات قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری جێبایەخی ولاتە تازەپێگەیشتووەکانە و گەورەترین کۆسپ لە بەردەم بەرپرسانی نەهێشتنی نەخوێندەواریدا دەستەبەرکردنی ئەو سەرچاوانەن کە گونجاون بۆ خوێندنەوەی ئەوانەی لە هەڵمەتەکاندا بەشدار دەبن، کەواتە پێویستە دەوڵەت بە تـەنیا خزمـەتگوزاریی خـۆی لـە شارەکان و ناوچە گوندنشینە گەورەکاندا نەخاتە کار، بەڵکو سیستمی کتێبخانەیی تـەواو لـە ناوچە گوندنشینە دوورەدەستەکانیشدا جێبەجێبکات، چونکە لـە هەنـدێ ولاتـدا کۆمـەڵگا گوندنشینەکان لە ناوچەی جیاواز و دوور لە شارەکاندان، بەڵکو لە هەندێکیاندا دەکەونە ناوچە شاخاوییەکان و گرفتی رێگاوبان پەیوەندیشیان هەیە.

بەلام کێشەی دەستەبەرکردنی کتێب بۆ ناوچە گوندنشینەکان، بە چـەند رێگایـەك چارەسەرکراوە، یەکێك لەو رێگایانە کتێبخانەی گەڕۆکە کە بەشـێوەیەکی راسـتەوخۆ

خزمەتگوزاریی خۆی دەگەیێنێ بەو سوودمەندانەی کە لە ناوچە تەریك و دوورەکاندا لە گوندە بچکۆلەکانیان ماڵەکانیاندا دەژین، کەوا قەوارەیان ڕێگا نادات کە کتێبخانـەی جێگیر، یان سەنتەری کتێبیـان تیـادا بکرێتـەوە، هـەروەها دەکـرێ کۆمەڵـە کتێـب بسپێرێت پێیان تا لە یەکێك لە خانووەکانـدا دابنرێـت و بـۆ خوێندنـەوە و خوێنـدن سوودیان لێ وەربگیرێت و ئەوانە وەك کتێبخانەی گوندیان لێدێت.

لەگەڵ ئەوانەشدا ئەو گرفتانەی ڕووبەڕووی خوێندنەوە لە گوندەکان دەبنـەوە کـەم نـین، دیارترینیان ئوتومبیلی گەڕۆك بۆ گەیاندنی کتێب ژمارەیان زۆر نییـە و نـاتوانن سـەرجەم ناوچەکان بەسەر بکەنەوە، هەرچـۆن زوو زوو ئـەو ئوتومبیلانـە لـە کـار دەکـەون و چـاك کردنەوەیان تێچووی زۆری دەوێ، کەواتە خزمەتگوزارییان سـنوورداره، گرفتێکـی تـر کـە ڕووبەڕووی خزمەتگوزاریی کتێبخانەی گشـتی دەبێتـەوە لـە گونـدەکان کـەمیی کتێـب و سەرچاوەکانی تری خوێندنەوەیە بە زمانی نەتەوەیی یان فەرمیی ئەو وڵاتە، ئەمەش دەبێتە ڕێگـر لـە ڕێـی خواسـتنی هەنـدێ لـە سەرچـاوەکان بەشـێوەیەکی دەوری لـە سـەنتەری گوندەکاندا، ئەمانە بێجگە لەوەی کـە دەبـێ لـە سـەنتەری ئـەو گوندانـەدا پێویسـت بـە کارمەندی خۆبەخش دەکات کە لە هەندێ بۆنەدا ئەو خزمەتگوزارییە ببەن بەڕێوە.

لە ڕاستییدا ئەو خۆبەخشانە ڕۆڵی کارمەندی کتێبخانەکان دەبیـنن، کـە بـە بـێ بەرامبەر یان بە پاداشتێکی زۆر کەم ئەو کارە بەڕێوە دەبەن، کەواتە پەیدا کردنی ئەو کەسانە زەحمەتە، لەبەر ئەوە زۆرجار مامۆستایان ڕۆڵی ئەوان دەبینن لـەو شـوێنانەدا کە دەبنە سەنتەری کتێبخانەی گوندەکان.

لە هەندێ جێگادا دانانی سەرپەرشتیاری گەڕۆك بۆ ئەو مەبەستە ئامانج دەپێکێ، ئەوانیش لای خۆیانەوە لە ناوچەکانیاندا یاریدەدەری ئەو کـارە بـۆ خۆیـان دادەنـێن و

ڕێنمایی پێویستیان دەکەن، هەروەها کتێبخانەی نەتەوەیی دەتوانێ بۆ خزمەتی زیاتر، پەیوەندی لەگەڵ کتێبخانە گشتییەکان و کتێبخانەی بچووکی گوندەکانیشەوە ببەستن بۆ سوودمەندبوون لە خزمەتگوزارییە گرنگەکانی کتێبخانەی نەتەوەیی، بە تایبەت بۆ وەرگرتنی زانیاری و بەشداریی کردن لە خول و مەشقەکانیاندا و وەرگرتنی زانیارییە هونەرییە نوێیەکان، کە کارمەندو هەڵسوڕاوانی ئەو کتێبخانانە پێویستییان پێییەتی.

**٨-خزمەتگوزاریی کەمئەندام و نەخۆشەکان:**

ماوەیەکی زۆرە خزمەتگوزارییەکانی کتێبخانە گشتییەکان بۆ هەموو خەڵکی پێشکەوتنی بەخۆوە دیوە، بۆ ئەوانەش کە هامشۆکردنیان بۆ کتێبخانە ئەرکێکی قورسە و بەزەحمەت دەیگەنێ، ئەوانە بریتیین لە کەمئەندام و پیرەکان، یان ئەوانەی گرفتی هۆشدارییان هەیە یان نەخۆشی سەرجێگایان، لەو جۆرە خزمەتگوزارییە لە ئێستادا دەگاتە نەخۆشخانەکان و ماڵی پیران و کەمئەندامان و ئەوانەش کە گرفتی بینین و بیستنیان هەیە، یان ئەوانەی کێشەی میشك و جووڵەیان هەیە، ئیتر گەورە بن یان منداڵ.

لە زۆر وڵاتدا خزمەتگوزاریی کتێبخانەیی گەیشتووەتە نەخۆشخانەکان، بەشی کتێبخانەی نەخۆشخانەکان لە (یەکێتی نێو دەوڵەتیی کۆمەڵە و دامەزراوە کتێبخانەییەکان IFLA) چەندین ڕاپۆرتی بڵاوکردۆتەوە سەبارەت بایەخی ئەو بەشە لە جۆرەکانی کتێبخانەکاندا، هەرچۆن لەم کتێبخانەیەدا کۆمەڵێك نامیلکە و ڕێبەری سوودبەخش سەبارەت بەو زانیارییانەی بۆ نەخۆشەکان پێویستن چنگ دەکەون، هەروەها لە چەند وڵاتێکدا پێودانەی پێویست بۆ چۆنێتی خزمەتگوزاریی کتێبخانەیی لە نەخۆشخانەکاندا داڕێژراوە، ئەمە بێجگە لە ئامادەکردنی لیستی بیبلیۆگرافی بۆ بەردەستی نەخۆشەکان تا ببێتە جێبایەخیان بۆ خوێندنەوەو کاتی باشبەسەربردن.

لەسەر پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریی کتێبخانەیی بۆ نەخۆشی نەخۆشخانەکان مشتومڕێك هەیە، ئایا کتێبخانەی نەخۆشخانە لە پاڵ گەیاندنی ئەو خزمەتگوزارییە بۆ پزیشك و کارمەندەکان دەبێ بە هەمان شێوە لە خزمەتی نەخۆشەکانیشدا بێت؟ یان ئەو ئەرکە هەر لە ئەستۆی کتێبخانەی گشتیدا دەبێت.

بەپێی سیستمی بەریتانی، کتێبخانەی نەخۆشخانە بەرپرسی سەرەکییە لە گشت لایەنەکانی ئەو خزمەتگوزارییە لە دامەزراوەکانی چاودێریی تەندرووستیدا، بەڵام دەبێ بۆ هەڵبژاردنی سەرچاوەکان هاوکاریی لە نێوان کتێبخانەی گشتی و کتێبخانەی نەخۆشخانەدا بکرێت، ئەوەش ئەگەری دووبارە بوونەوەی سەرچاوەکان کەم دەکاتەوە و هەر دوو لا ئاگاداری کتێبەکانی یەکتر دەبن.

کتێبخانەی نەخۆشخانەکان بە تایبەت وەڵامی داواکاریی ئەو نەخۆشانە نادەنەوە کە لە نەخۆشخانەکاندا، بەڵکو بەتەنگ ئەوانەشەوە دێن کە لە ماڵەکانی خۆیاندا میوانی سەرجێگان و ناتوانن بۆ وەرگرتنی کتێب روو لە کتێبخانە گشتییەکان بکەن، لەو کاتانەدا دەبێت ئوتومبیل بەکار بهێنرێت بۆ دابەشکردنی کتێب و وەرگرتنەوەیان، هەرچۆن دەتوانرێ بە پۆستەدا کتێب بنێردرێت بۆ نەخۆشی ناوچە دوورەکان، هاوکات کتێب بەشێوەی خواستن دەدرێتە ئەوانەی چاویان کزە.

بەڵام خزمەتگوزاریی کتێبخانەی گشتیی بۆ نابینایان، لەسەرەتادا لە زۆر شوێن بەشێوەیەکی خۆبەخشانەبووە و دواتر بووەتە بەشێك لە ئەرکە ئاساییەکانی کتێبخانە، هەمیشە بۆ نابیناکان کەرەستەی تایبەت دادەنرێ، وەك کتێبی چاپکراو بە پیتی دیار و گەورە، یان کتێبی بیستراو.

پێویستە یاساکانی کتێبخانە لە هەر وڵاتێکدا جەخت لەسەر خزمەتگوزاریی نابینایان بکاتەوە لەلایەن کتێبخانەی گشتییەوە، کاریش بە راسپاردەکانی IFLA

بکرێت، کە بەشێکیان خستنە بەردەستی گەلانامەی نێو دەوڵەتییە بۆ خزمەتی نابینایان، هاوکات پێناسەی سەرچاوەکانیان دەکات و گەشە بە میکانیزمی خواستن دەدات لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتی، لەگەڵ ڕێکخستنی سوودوەرگرتن لە تەکنەلۆجیاکان کە لە پێناوی نابینایان لە ئێستاداو بۆ داهاتوو داهێنراون.

لە زۆر وڵاتیشدا کتێبخانەی گشتی خزمەتگوزاریی پێشکەش بە مرۆڤە کالْفامەکان دەکات، ئەوانەی لە ڕووی هۆشدارییەوە دواکەوتوون و ناتوانن بگەنە کتێبخانە، بۆ خزمەتی ئەوان لەڕێی پۆستەوە سەرچاوەکانیان پێدەگەێنرێت، یان بە هۆی ئوتومبیلی تایبەتەوە کە دەگاتە ئەو جێگایانەی ئەو مرۆڤانەی تیادا دەژین، تەنانەت دەیگەێننە ماڵەکانیان، بۆ کەمئەندامان ناوبەناو جۆری سەرچاوەکان دەگۆڕدرێن بە هی تر تا زۆرترین سوودی لێ وەرگرن، خوێندنەوە بۆ ئەوان دەبێتە دەرفەتی دەرکەوتنی توانایان و بایەخیان، هەرچۆن گەشە بە کارەکانیان دەدات لە ڕووی پیشەگەریی و لێهاتووییەوە، دیسانەوە ئەم کۆمەکەی کەمئەندامان دەبێتە فاکتەری ئەوەی بە جۆرێك سوودمەند بن لە خوێندنەوە کە سەربەخۆیانە خۆ ببەن بەڕێوەو کەمتر پێویستیان بە پشتبەستن بێ بە کەسانی تر.

دەبێ بە تەنیا سەرچاوەکانی خوێندنەوە نەخرێنە بەردەست ئەم توێژەی کۆمەڵگا، بەڵکو دەبێ فیلم و تۆمار و نیگار و سەرچاوەکانی سێ ڕەهەندی (واتە ئەو سەرچاوانەی پەیوەستن بەو مەشقانەی دەیکەن، ئیدی لە ماڵدا بێ لەنێو خێزانەکانیان یان لە دامەزراوەکانی چاودێریی تایبەت بە خۆیان).

دەبێ لە کتێبخانەی گشتیدا کەسێك بەرپرسیار بێ لەو جۆرە سەرچاوانە، ئەویش لە پێناوی باشتر خزمەتکردنی ئەو توێژەی کە پێویستیان بە بایەخی تایبەت هەیە.

هەرچەندە بایەخی سوودمەندان، ئەوانەی بـە شـێوەیەکی ڕێـك وپێـك و بـەردەوام هامشۆی کتێبخانە گشتییەکان بکـەن، بەشـێوەیەکی بەرچـاو کەمبووەتـەوە، لەگـەڵ ئەوەشدا هێشتا سوودمەندان لە خزمەتگوزارییەکانی کتێبخانە گشتییەکان هەر زۆرن، ئەوانەی سەرەتای هامشـۆیانە بـۆ کتێبخانـە، کاتێـك دەبیـنین کتێـب و سەرچـاوەی کتێبخانەیی تریان بێ بەرامبەر پێدەدرێت، تووشی رامان دەبن، هەرچۆن ئەوانـەی بـۆ یەکەمجار سەر دەکەن بەکتێبخانەدا هیچ لەو ئاسانکارییە نازانن کە کتێبخانە بۆیـانی دەکات، ئیتر لە وەڵامی پرسـیارە دیاریکراوەکانـدا بـێ، یـان چـۆنێتی بینینـی ئـەو سەرچاوانەی کە دەگمەنن و لە کتێبخانەدا لەبەر دەست دانانرێن، تەنیا کەمێکیش لەو هامشۆکەرانە ئاگاداری ئەو خزمەتگوزارییـە تایبەتانـەن کـە لەلایـەن بەڕێوەبـەرێتی کتێبخانەوە پێشکەش دەکرێن، وەکو خزمەتگوزاریی ئەوانەی ناتوانن لە ماڵ بێنەدەر، یان ئەوانەی پێشکەش بە کەمئەندامان دەکرێت لە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکاندا، یان خزمـەتگوزاریی کتێبخانـەیی تایبـەت بـە زیندانـەکان، یـان قوتابخانـەکان، یـاخود دەستەبەرکردنی سەرچاوە بۆ گروپە ئیتنیکی و نەتەوایەتییەکان.

چالاکییەکانی تری کتێبخانە گشتییەکان، بریتیین لە:

**١- برەو پێدانی خزمەتگوزارییەکانی کتێبخانە :**

بازاڕاندن، یان بازاڕگەرمکردن هۆکاری گرنگە بۆ برەودان بە خزمەتگوزارییـەکانی کتێبخانە گشتییەکان، بەڵام دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگیرێت کە هەندێ جارئەو برەودانـە بە ئەنجامی پێچەوانە دەشـکێتەوە، ئـەویش لـەو کاتانـەدا کـە کتێبخانـە نـەتوانێت ئامانجی خۆی بپێکێت، بە تایبەت کاتێك کتێبخانە نەیتوانیبێ ئامادەباشـی بـۆ ئـەو مەسەلەیە بکات، یان بانگەشە بۆ ئەوە پێشـبینی زیـاتری لـەلای خـەڵکی درووسـت

کردبێت لەچاو ئەوەی کە دەبینین، کەواتــە دەبــێ بانگەشــە بــۆ ئــەو برەوپێدانــە لــە کاتێکدا بێ کە خزمەتگوزارییە راگەیاندراوەکە گەیشتبێتە ئاســتێکی گونجــاو، ئــیتر لەرووی چۆنایەتییەوە بێت یان چەندایەتییەوە.

ئەم بازاڕگەرمکردنەی کتێبخانە جیاوازە لەوەی لە چالاکیی بازرگانیدا دەنوێنرێت، چونکە بانگەشەو ریکلامی بازرگانی سروشتێکی پێشــبڕکێی هەیــە و بەرهــەمێك لــە یەکێکی تر لەلای خەڵکی شیرین تر دەکات.

بەڵام وەك دەزانین بواری کتیبخانە بوارێك نییە بــۆ پێشــبڕکێ و ململانــێ، بــەڵام مەبەست لە ریکلام کردن بۆی ئاگادارکردنەوەی سوودمەندانە لە خزمەتگوزارییەکانی، لەوانەدا خەڵکی لە ئاسانکارییەکانی کتێبخانە ئاگادار دەکرێنەوە، بێگومان چالاکیی کتێبخانەیەك بۆ یەکێکی تر جیاوازە، ئەویش بەندە بە توانای هەریەکەیانەوە لە رووی "هەڵکەوتەی تەلار، ئامێر و کەرەستە، کارمەندان، بودجە، سەرچاوەکانی و...تاد" ، هەرچۆن هەر کتێبخانەیــەك بــەپێی ئــەو کۆمەڵگایــە دەگۆڕدرێــت کــە لــە پێناویــدا خزمەتگوزارییەکانی پێشکەش دەکات، هەڵبەت پلان و سیاسەتی کارگێڕیی خۆجیەتی هەر شوێنێك رۆڵی دەبێ لەسەر چەشنی کتێبخانەی گشتیی کە دەکەوێتە سنووری ئەو کارگێڕییەوە.

زۆر گرنگە رۆڵی ئەمینداری کتێبخانە لەبەرچاو بگرین، بە تایبەت لــە کتێبخانــە بچووکەکاندا کە یەك ئەمینداریان هەیە، ئەویش لــەرووی بانگەشــەو بــە بــازاڕکردنی خزمەتگوزارییەکانی کتێبخانەکەی.

ئەمینــدار و کارمەنــدی کتێبخانــە دەبــێ نیشــتەجێی ئــەو ناوچــەیە بــن کــە کتێبخانەکــەی تێدایــە و دەبــێ لــەلای خــەڵکی ناوچــەکە ناســراو بــێ و پەیوەنــدیی

هەبێ‌پێیانەوە لە پێداویستیەکانیان ئاگادار بێت، بەوەش کتێبخانە دەبێتە بەشێك لە کۆمەڵگاو لێی جودا نابێتەوە، هەروەها پێویستە ئەمینداری کتێبخانە رۆڵێکی بەرچاوی هەبێ لە چالاکییەکانی ناوچەکەیاندا، پەیوەندییەکانی ئەو رۆڵی گەورەی دەبێ لە دانەبڕانی کتێبخانە و کۆمەڵگای دەوروبەری، بەڵام گرنگە ئەو ئەمیندارە لە خەسڵەتییە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵگاکەی شارەزا بێت و ئەوەش رۆڵی دەبێ لە برەودان بە چالاکییەکانی، هەروەها پێویستە لێکۆڵینەوە بکلت لە جۆری دانیشتووانی ناوچەکەی، بازاڕەکان، هاتوچۆ، بونیادی کۆمەڵایەتی، ناوەندی تەمەنی خەڵکی ئەو ناوچەیە و بۆ هەموو ئەوانەش پێویستی بە سەرچاوەی زانیاریی دەبێ بۆ ئاگاداربوون لە هەموو ئەو پرسانە.

**٢-بەشداریی لە تەلاری کتێبخانەدا**

هەندێ شتی تر هەیە کە دەبێتەهۆکاری پەیوەندیی پتەو لە نێوان کتێبخانەو ژینگەو دەوروبەری، وەك رێگادان بە نووسینگەیەکی راوێژکاریی بۆ هاووڵاتیان لە ناو کتێبخانەدا، یان سەنتەرێك بۆ زانیاریی گەشتوگوزار، یان نووسینگەی دامەزراندن و لەو جۆرانە، ئەمە هەرچۆن دەبێتە هاوکاریی کتێبخانە بۆ ئەو نووسینگەو ئەو مەبەستانە هاوکات ئەوانەش کاریگەرییان دەبێت لەسەر بەهێزکردنی لایەنی راگەیان، یان میدیایی کتیبخانە، هەرچۆن کتێبخانە سوودمەند دەبێت لە بەشداریی کردنی سەرچاوەکانی هەندێك زانیاریی گشتیدا.

گەر ئەوانە نەلوا، ئەوا بوونی کتێبخانە لە جێگایەکی گرنگ و دیاردا و تەلارێکی هاوبەشدا لەگەڵ (بۆ نموونە) نووسینگەیەکی خزمەتگوزاریی کۆمەڵایەتی، یان کلینیکێکی پزیشکی، یان نووسینگەیەکی تۆمارکردن، یان مۆزەخانەیەکدا، ئەوا

یارمەتیی دەدات لە شوێنێکدا دەستبەکاربێت کە بە گرنگ دەزانرێت لای کۆمەڵگاو هاوکات سوودی هاوبەش دەگەێنن بە گشت ئەو دام و دەزگایانەی جێبایەخن، واتە کتێبخانەکەو نووسینگە هاوسێکانی دەبنە مایەی سوودبینین لەو شوێن هەڵبژاردنەیان.

رۆڵی کتێبخانە بەردەوام لە پێشکەوتندایە، چونکە مەڵبەندی پاراستنی ئەو زانیارییانەیە کە تاکەکانی کۆمەڵ سوودی لێ دەبینن، کتێبخانە جێئامانجی هەندێك لە رێکخراو دامەزراوە حکومەتی و ناوچەییەکانەو مەبەستیانەبەهۆیەوە بەشێك لەو زانیارییانە بگەێننە خەڵکی، بۆ نموونە چاپکراوەکانی وەزارەت و دامەزراوەکان بەهۆی کتێبخانەوە دەگاتە سوودمەندانیان، کەواتە بەرژەوەندیی هاوبەش لە نێوان ئەوان و کتێبخانەی گشتیدا هەیە، مەرامی ئەوان دێتەدی و کتێبخانەش بێبەرامبەر کۆمەڵێ سەرچاوەی چنگ دەکەوێت، لێرەوە کتێبخانە دەتوانێ بانگەشەی چاك بۆ خزمەتگوزارییەکانی خۆی بکات و هاوکات تۆڕەکانی پەیوەندیی خۆی لەگەڵ دامەزراوەکانی نێو کۆمەڵگا پتەوتر بکات.

هەرچۆن کتێبخانە لە رێگای تری جۆراوجۆریشەوە دەتوانێ پەیوەندی خۆی بە کۆمەڵگاوە گرێبدات، لەوانە: هاندانی دامەزراوە نەتەوەیی و ناوچەییەکان بۆ کردنەوەی پێشانگا لە تەلاری کتێبخانەدا، رۆڵ بینین وەك سەنتەری بازنەکانی هەڵبژاردن، ئامادەکردنی رۆژمێری تایبەت بە رووداوەکانی شارو ناوچەکە، بەوەش مێژووی بۆنەکان جێگیر دەبێت و بە هەڵە بەکارناهێنرێن، بەهۆی ئەوانیشەوە پەیوەندیی هەموان بە کتێبخانەوە بەردەوام دەبێت.

### ٣- لێدوانی كتێبخانه:

ئەگەر كارمەندی كتێبخانه له كۆمەڵەكەی خۆیدا ناسراو بوو، ئەوا دەبێت ناوبەناو باسێك له كتێبخانەكەی بكات، دیاره هەندێ خەڵكی بەهرەمەندن وبه كارامەیی دەدوێن، چونكه سروشتی خۆیان وەهایه و قسەكەری باشن، بەڵام هەندێكی تر وەها نین و پێویسته خۆیان رابهێنن، بەڕێوەبەرایەتیی سەركەوتووە كتێبخانه دەزانێت كامه كارمەند به توانان بۆ ئاخافتن و كێ دەتوانێ بەرامبەر خەڵكێكی زۆر، وەك بەشێك له كارەكەی لێدوان بدات.

دەبێ بۆ ئەم لایەنه كۆمەڵێك خاڵ لەبەرچاو بگیرێت، دیاره ئەمینداری كتێبخانه، یان هەر كارمەندێك دەتوانن بۆ خەڵكێكی ئاسایی بەباشی بدوێن، بەڵام بۆ ژمارەیەك پسپۆڕ و شارەزا و كارمەندی بواری كتێبخانەكان بەو جۆره نابن، چونكه جۆرەكەی یەكەمیان له چەند زانیارییەكی ئاسایی بەولاوه شتی ئەوتۆ سەبارەت به كتێبخانه نازانن، كەواته واباشه لێدوان بۆ ئەوان نافەرمی و بەشێوازێكی دۆستانه بێت واباشه قسەكەر به تەنیا چەند خاڵێكی گشتی لەبەردەستدا بێ بۆ لێدوان، نەوەك خوێندنەوەی تێكستێكی لەوەوبەر ئامادەكراوی، چونكه لێدوان له باسێكی بچووكدا وا دەكات خاوەنەكەی به شێوەیەكی سروشتی دەربكەوێت، هەرچۆن یاریدەدەر دەبێ كه به باشی وەڵامی پرسیار بداتەوە، بەڵام پێویسته بیرۆكەی رۆشنی هەبێ بۆ لێدوانەكەی و لەسەرخۆ و به روونی قسەكانی بدركێنێت، چونكه قسەكردنی به پەله به تایبەت بۆ خەڵكی گشتی وا دەكات به تێكەڵ و پێكەڵ له دەم بێنه دەرێ و ئەوەی لێدوان دەدات شپرزەیی پێوه دیار دەبێت، به تایبەت گەر رستەكان به خێراییەكی زۆر بوترێن،

باشتریش وایە بە زمانێکی دوور لە پێشەمەندیی قسەبکرێت، چونکە ئەو زمانە بە کەڵکی ئەو کاتە دێت کە قسە لەگەڵ کارمەندی کتێبخانەکاندا بکرێت.

گونجاویش وەهایە بۆ لێدوان ئاستی تەمەن و خوێندن و هۆشیاری بیستەرەکان لەبەرچاو بگیرێت، پێویستە ئەمینداری کتێبخانە پێش وەخت ئەو بابەتانە دیاری بکات کە قسەیان لەسەر دەکات و ئەوانە بن کە دەچنە نێو بازنەی بایەخی گوێگرەکانەوە، هەرچۆن پارێزگاریی لە ئاستی دەنگ و تۆن و دەربڕین و دەمو دوو بە بنەمای لێدوانی ئەو کەسە دادەنرێت.

دەبێ ئەو کەسەی دەدوێ لێزان بێ و ئەمانە جێبەجێ بکات: ئاستی دەنگ و گوزارشت، زمانە جەستە وەك گوزارشتی دەموچاو و جووڵەی هەردوو دەست، باشتریش وایە ئەوەی قسە دەکات هەندێ کتێب یان سەرچاوە بیستراو و بینراوەکان، یان نەخشە و نیگار لەگەڵ خۆیدا بهێنێ و بەکاریانبهێنێ، چونکە ئەوانە شتی بیر دەخەنەوە و بەرامبەرەکانیش باشتر لێی تێدەگەن، هەرچۆن دەیانداتێ تا تەماشای بکەن و جەخت لە گوێگرتنەکەشیان بکەنەوە، زۆرجاریش قسەکەر بەر لە لێدوان بە گاڵتەیەك، یان قسەیەکی خۆش دەست پێبکات باشترە تا گرژیی نێوان خۆی و ئەوان خاوبێتەوە، ئەوە سەرەتایەکی باش دەبێت، پێویست دەکات بەوپەڕی دەربڕینی دڵسۆزی و خەمخۆرییەوە قسە بکات تا بەرامبەرەکانی قایل بکات، ئەگەر هەستی کرد بەرامبەرەکەی وەڕس دەبێ ئەوای دەبێ شێوازی خۆی بگۆڕێ.

پەیوەندی لە نیوان دوولادا دێتە دی ئەگەر قسەکەر سوور بێ لەسەر هاندانی گوێگرانی بۆ قسە کردن و پرسیار، ئەوا ئەنجامی دیدارەکە باش دەبێت، ئەمان وێرایی شارەزای کارمەند لە بابەتی لێدوانەکەی.

ئامانج لەوەش بازاڕاندنی خزمەتگوزاریی کتێبخانەیە، ئەوەش بە وەڵام دانەوەی هەر پرسیارێك دێتەدی کە لە سنووری ئەو باسەدا بێت، باشتر وایە دوای قسەکانی، ئەو کارمەندە هەندێ بڵاوکراوە بەسەر ئامادەبووانـدا دابەش بکات، ئەوەش بۆ سەلماندنی قسەکانی بە کەڵك دێت و کە ئەوێشیان بەجێهێشت، هەمیشە خزمەتگوزاریی کتێبخانەکەیان لەیاد دەبێ.

دەبێ ئەمینداری کتێبخانە شێوازێکی تر گەیشتن بە خەڵکی پەیڕەو بکات، ئەویش لە ڕێی رادیۆوە دێتە دی، ئەو دەتوانێ چەند بەرنامەیەك بەسەرکەوتووی لەرێی رادێوی ناوخۆییەوە بەڕێوە ببات، ئەمەش ڕێگایەکی باشە بۆ گەیشتن بەو کەسانەی کە لەوەبەر لە کتێبخانە سوودمەند نەبوون، دەبێ لێدوانەکەی رادێو سەرنج راکێش بن و بە خولەك و چرکە حسابیان بۆ بکرێت، هەر چۆن دەبێ کورت بن و شێوازێکی وەسفیان هەبێ تاوەکو لە خەیاڵی بیستەردا وێنەیەك دروست بکەن، بێجگە لەوانە دەبێ شێوەی پێشکەش کردنیان بە پلەیەکی زۆر سروشتی بن و ئەوەی دەیانخوێنێتەوە وەك ئەوە وابێ قسە بۆ خەڵکەکە بکات کە لە بەردەمیدا وەستا بن .

هەندێ سەردان هەیە تایبەت بۆ ئاشنا بوون بە کتێبخانە، سەردانی دیکەش هەیە وەك پێشانگای کتێب، یان کۆڕو کۆبوونەوە، ئەمانەی دووەم دیسانەوە دەبنە هۆکاری برەودان بە کتێبخانە.

جۆرێکی تر لە چالاکییەکان لێدوانی نووسەران یان شێوەکاران، یان کتێب دۆستان لە کتێبخانەدا، هەروەها لێداوانی باش نمایشی فیلم و بابەتە هونەرییەکان، ئەو لێدوانانە بەجۆرێك لە جۆرەکان یان پەیوەندی هەیە بە کتێبخانەوە، یان ئەوانەی دەدوێن باسی ئەو شتانە دەکەن کە لە سەرچاوەکانی کتێبخانەوە وەریان کردوە، وەك

مێژووی ئەو ناوچەیەی کتێبخانەکە دەکەوێتە ناویـەوە، ئەمانـە هـەموویان هۆکـاری باشن بۆ نزیکترکردنەوەو گرێدانی کتێبخانە بە کۆمەڵگاوە. ئەمانە باشـترین ڕێگاشـن بۆ لایەنی راگەیاندن و میدیای کتێبخانە، دەرفەتیشە بۆ گەشتی میوانان و بەشدارانی چالاکییەکان بە بەشەکانی کتێبخانەدا .

**٤-پەیوەندیی راستەوخۆ بە گروپ و دەستەکانەوە:**

نامەنەوێ دووپاتی بایەخی پەیوەندیی راسـتەوخۆ بـە سـوودمەندانی کتێبخانـەوە بکەینەوە، بە تایبەت ئەوانەی لەبری سەردانی کتێبخانە پەیوەندی تەلەفۆنی دەکـەن، بەڵام هەندێ پەیوەندیی بە گروپی دیاریکراوەوە مەبەست دەپێکێ، بۆ نموونە بە وانـەی لە بازرگانی و پیشەسازیدا کاردەکـەن، هـەروەها بەسـتنی کـۆڕو کۆبوونـەوە لەگـەڵ سوودمەندان بۆ ئاشنابوون بە هۆکارەکانی باشتر بەکارهێنانی سەرچاوەکانی کتێبخانە، لەو کۆڕانەدا گەلێك بابەت باسدەکرێن، وەکو: بەکارهێنانی پێڕستەکان، پلانی پۆلێن، سەرچـاوە بەردەسـتەکان و دابەشـکردنیان بەسـەر کتێبخانـەدا، بـەکارهێنانی کتێبخانەکانی تر وەك کتێبخانەی کۆلیجـەکان و کتێبخانـەی دامـەزراوی فێرکردنـی گەورەکان و مەڵبەندە رۆشنبیری و پەیمانگا هونەرییەکان، وێـڕای ئەوانـە، بابـەتی تـر لەگەڵ ئەو گروپانە باسدەکرێن، وەکو پلانەکانی خواسـتن لـە نێـوان کتێبخانەکانـدا و پەیوەندیی بە تۆڕەکانی زانیاریی ناوخۆ و دەرەکییەوە.

بەشداریی خەڵکی لـەم چـالاکییانەدا بـە سـوودی هـەردوولا دەگەڕێتـەوە، واتـە کتێبخانە و گروپەکانی خەڵك، بەڵام بەر لە دەستکردن بەو پڕۆژانە، دەبێ کارمەندانی کتێبخانە شارەزایی تەواویان هەبێ لەو بەرنامانەی لە کۆڕو کۆبوونەوەکانـدا دەیخەنـە روو.

### ٥-کۆمەڵەی هاوڕێیانی کتێبخانە:

یەکێك لە چالاکییە گرنگەگانی کتێبخانەی گشتی، پێکهێنانی گروپی هاوڕێیانی کتێبخانەیە، ئەم گروپە لە ژمارەیەك کارمەندی کتێبخانەو چەند کەسێك لەو سوودمەندانە پێکدێت کە ئارەزوو و کات و توانای خزمەتی کتێبخانەیان هەیە.

بە پلەی یەکەم، ئەم کۆمەڵەیە کار دەکات لە پێناوی ئاشنابوونی خەڵکی بە کتێب و سەرچاوە جۆر بە جۆرەکان و خزمەتگوزاریی کتێبخانەی گشتی، هەرچۆن رۆڵی دەبێتە پەیداکردنی سەرچاوەی دارایی لە تاکەکانی کۆمەڵگاو دامەزراوە بۆ دابینکردنی ئەو کەرەستانەی پێویستن بۆ کتێبخانە، ئیتر سەرچاوەو کتێب یان کەلوپەلی کتێبخانە، بۆ نموونە بۆ کڕینی دەستنووسێکی دەگمەن کەلە بودجەدا پارە بۆ ئەوانە تەرخان ناکرێت.

### ٦-بانگەشەو ئاگاداری:

لە سالآنی رابردوودا پێشکەوتنی بەرچاو لە نمایشی کالآو خزمەتگوزارییەکان بەدیهاتووە، ئەویش لە رێی نیشاندان و بانگەشە بۆکردنەوە، هەندێ لەو لەرێی نیشاندان و بانگەشە بۆ کردنەوە، هەندێ لەو پێشکەوتنە بەندە بە ئاستی چاپەمەنی و ریکلامەکانەوە، وەك لە بازرگانی و پیشەسازیدا بەدیهاتووە، هاوکات لە کتێبخانەکانیشدا بە هەمان شێوەیەو ئاستی بالآی سەرچاوە چاپکراوەکان و خزمەتگوزاریی کتێبخانە بووەتە هۆی زۆر روونکردنەوە کتێبخانەو خوێندنەوە و هەڵسەنگاندنیان.

لە کتێبخانەی گشتیدا، بانگەشەو ئاگاداری نامەکان ونمایش کتێبەکان بوونەتە هۆکاری فراوانبوونی خزمەتگوزارییەکانی، بەو پێیەش کە کۆمەکی دارایی کتێبخانە

لەلایەن دەسەڵاتی بەرپرسەوەیە، دەبێ ئەو دەسەڵاتە قایل بێ بە خزمەتگوزارییەکانی کتێبخانە تا کۆمەکی زیاتری بکات.

لێرەوە، دەبینین لە هەندێ کتێبخانەدا بەشی تایبەت بە راگەیاندن و بانگەشەی تێدا کراوەتەوە، شێوەیەکی ئەو بانگەشەیە لە نمایشی سەرچاوەکاندایە کەهەندێ کەسی هونەرمەند ئەو کارە دەکەن، هاوکات هەندێ کتێبخانەی تر لەگەڵ نەخشەسازیدا رێدەکەون بۆ رازاندنەوەی ناونیشانەکان بەرگی لیستی کتێبەکان و هێماکانی کتێبخانە، دیارە ئەو گەشەکردنەی لە چاپ و دیزایندا هاتووەتە دی کاریگەریی هەیە لەسەر نمایش و جوانترکردنی خزمەتگوزارییەکانی کتێبخانە.

لەو کاتانەشدا کە کتێبخانە خاوەنی بودجەیەکی کەم بێ ئەوا بە پێی ئەو بودجەیە هەنگاوەکانی بانگەشەو ئاگادارییەکانی هەڵدەگیرێت، دەبێ بە وردی کارە هونەرییەکان لەو پێناوەدا ئەنجام دەدرێن.

**٧-راپۆرت:**

ساڵانێکی دوور و درێژ راپۆرتە ساڵانەکان بۆ خزمەتگوزاریی کتێبخانە بە هەند وەرگێراوە و تا ئێستاش هەندێك کتێبخانە ئەو راپۆرتانە بڵاودەکاتەوە، بە جۆرێك دەخرێنە بەرچاو، کە لایەنی هونەرییان ناوازە بێت و ببێتە چالاکیی چاپەمەنیی سەرەکیی خزمەتگوزاریی کتێبخانە، بەڵام لە ئێستادا بەهای ئەو راپۆرتانە لەژێر پرسیاردایە، چونکە جاران کەموکوڕیی لە هۆکارەکانی بانگەشەدا هەبووە بۆ دەستکەوتەکانی کتێبخانە. دەبێ لە چاپکردنی ئەو راپۆرتانەدا تێچووی چاپیان لەبەرچاو بگیرێت، چونکە بێجگە لە بەهای مێژوویان ئەو سوودە نابەخشن، لە ئێستادا بڵاوکراوەی ساکار گرنکە کە لەرووی کوالیتی چاپەوە باش بێت سەرەکیترین

ئاماری خزمەتگوزارییەکانی کتێبخانە لـەخۆبگرێت، کـە تیایـدا وێنـە بـەکاربێت و پەرەگرافی پێشەکیشی بۆ دابنرێت، ئەگەر بەو جۆرە بوو ئەوا کتێبخانـە دەتوانـێ بـە تیراژی زۆر چاپ و بڵاوی بکاتەوە، دەبێ بە جۆرێك بێ، بچووك تا لە گیرفانی چاکەتدا جێگای بێتەوە، بۆ تەماشاکردنی هەر کاتێ بویسترێت، هەرچۆن دەبێ ناوەرۆکەکەی بە سادەیی دابڕێژرێت، تا کارمەندانی کتێبخانە سوودی لێ وەربگرن و بەکاری بهێننـەوە هەر کاتێ پێویستییان پێی بێت.

**٨-بڵاوکراوەکان:**

هەر کتێبخانەیەك پێویستی بە بڵاوکراوەکەیە کە سـادە بێـت و هاوکـات سـەرنج ڕاکێش بێت، تیایدا بواری خزمەتگوزاریی کتێبخانەکە بخرێتە بەرچـاو، دەبـێ تیایـدا ناوی گشت کتێبخانەکانی تر کە سەر بەو کتێبخانەیەن، یان لە سیسـتمێکدا پێکـەوە کاردەکەن بنووسرێت، لەگەڵ ناونیشان و ژمارەی تەلەفۆنیان، هەروەها دەبێ ڕێنماییـە سەرەکییەکانی بەکارهێنانی کتێبخانە لە بڵاوکراوەکەدا بخرێنە بەرچاو و دەبێ ئەمە لە گشـت بەشـەکانی خزمـەتگوزاریی کتێبخانـەدا دابنرێـت، تـا بەباشـی ببینرێـت و بەکاربهێنرێێت.

پێویستە ئەو بڵاوکراوەیە لە دامەزراوە پەروەردەیی و ڕۆشنبیرییەکانیش دابنرێـت، تا خەڵکی لە خزمەتگوزارییەکانی کتێبخانـەی گشـتی تێبگـەن و هامشـۆی بکـەن، هەروەها لە هەندێ بازاڕ و شوێنە گشتییەکانی ترو کلینکی پزیشکان.

ئەگەر سیستمی کتێبخانە فراوان بوو و کۆمەڵێك کتیبخانـەی تـر بەسـترابوونەوە پێیەوە، دەکرێ وەك پاشکۆ بۆ بڵاوکراوە سەرەکییەکە، بڵاوکراوەی تر ئامادە بکـرێن، تیایاندا پێگەی هەریەکـەیان لـە کۆمەڵـدا روون بکرێتـەوە، لەگـەڵ باسـکردنی ئـەو

ئاسانکارییەی لە خزمەتگوزارییاندا بەرجەستە دەکرێت، پێویستە ئەو بڵاوکراوانە هەموویان یەك فۆرمیان هەبێت، هەروەها پێویستە تیایاندا باس لە سەرچاوەکانی کتێبخانە و بابەتەکانی تایبەت بە مێژووی ناوچەکەو خزمەتگوزاریی بەشەکانی منداڵان و قوتابیان و خاوەن پێداویستیە تایبەتەکان و سەرچاوە ئیتنیکییەکان و سەرچاوە بیستراو بینراوەکان و سەرچاوەکانی موزیك و شانۆ و شێوەکاری بخرێنەروو.

## ٩-چاپکراوەکانی مێژووی ناوچەکە:

چاپکراوەکانی خزمەتگوزاریی کتێبخانەیی یارمەتیدەر دەبن لە باشترکردنی وێنەی کتێبخانەدا، بە تایبەت ئەوانەی لە خزمەتی هەموو کۆمەڵگادا دەبن بەشێوەیەکی راستەوخۆ، بڵاوکردنەوەی کاتێك لەسەر مێژوو، یان شوێنەواری ناوچەیەك بۆشایی پڕ دەکەنەوە، ئەگەر ئەمینداری کتێبخانە بابەتی ئەو چاپکراوانەی بەباشی هەڵبژاردبێت، ئەوا دەبێتە جێی بایەخی خەڵکێکی زۆر. مەرجیش نییە بڵاوکردنەوەی چاپکراوەکان تەنیا بۆ بەرهەمی تازە بن، بەڵکو بۆ ئەوانەی پێشووش پێویستن کە بە باشی بڵاونەبووتەنەوە، یان زیادە و وێنە و نەخشەی نوێیان خراوەتەسەر، یاخود روونکرنەوەو پاشکۆی زیادەیان بۆ دانراوە. هەندێك لە کتێبخانەکان کارێکی باش دەکەن کە لە نێو سەرچاوەکانیاندا کۆمەڵی وێنە و نەخشە و روونکردنەوەو دەدۆزنەوەو لە شێوەی نامیلکەو کتێبدا یەکیان دەخەن و سەر لە نوێ لە چاپیان دەدەن، هەرچۆن هەندێ کتێبخانەی تر زیرەکانە سوود لە سامانی کتێبخانەو سەرچاوەکانیان وەردەگرت و وەك رێبەر و چاپکراوی فێرکاری و زانیارییەکان دەیانخەنە بەرچاو.

**١٠-پێڕستە چاپکراوەکان:**

پێڕستی چاپکراو بەهایەکی راستەوخۆی هەیەو کۆکردنەوەی لیستی پێڕستەکان لە کۆمپیوتەردا کارئاسانی کردوە بۆ بەرهەمهێنانی کۆی لیستی سەرچاوەکان.

لەم جۆرە چارەسەرەدا، ئەو سەرچاوانە کۆدەبنەوە کە لە تاخچینی جیاوازدا دانراون، وەك نۆتەی موزیك و شانۆنامەو کتێبی مێژوویی ناوچەیەکی دیاریکراو.

دیارە کتێب، بەرفراوانیی بڵاوبوونەوەی بەندە بە پێودانە جیهانییەکانی نەخشەسازی و چاپ و سەرنج راکێشییانەوە، بەڵام پێڕست بە ناوەرۆکییەوە، کە یەکەم خاڵی سەرنج دەبێ لای سوودمەندان، بە مەرجێ بەرگی جوانیان بۆ بکرێ.

بەڵام لیستی تازە بۆ کتێبە نوێیەکان دەبێ یەك لە دوای یەك ئامادەبکرێن، هەروەها لیستی پێڕستی ئەو کتێبانەی لە کۆمەڵە سەرچاوەکان دوورخراونەتەوە.

هەرچۆن کتێبخانە دەتوانێ پێڕست بۆ هەڵبژاردەیەك لە سەرچاوەکانی بۆ دەزگا رەسمییەکان، یان بازرگانییەکان ئامادە بکات کە بۆ بۆنە و کاری تایبەت سوودمەند بن لێی.

**١١-پۆستەر و ریکلام:**

لە گشت کتێبخانەیەکدا پۆستەر و ریکلام هەڵواسین رۆڵی گەورەیان هەیە، پێویستە گرنگی تەواو بدرێت بە نەخشەسازیی ئەو پۆستەرانە، چونکە بەشێوەیەکی بەردەوام لەبەرچاوی خەڵکیدا دەبن، هەرچۆن پەیامی گرنگی خۆشیان دەگەیێنن، لە ئێستادا کتێبخانەکان گەشەیان کردوە هەر بۆیە ئەوانە چاپ دەکرێن بە جوانی و بە قەوارەی گەورە و پێویست و لە شوێنە بەرچاوەکاندا هەڵدەواسرێن، دەبێ رستەی

نووسراوی سەر پۆستەرەکان بۆ خوێندنەوە کورت و ئاسان بێت، دەکرێ کتێبخانە یەك ستایل و شێواز بۆ پۆستەرەکانی بەکاربهێنێت، تا بەباشی بناسرێنەوە.

ئەم پۆستەر و ئاگادارینامانە تایبەتن بە چالاکییەکانی کتێبخانەی گشتی ، هەربۆیە بۆ مانەوەیان و بەرگەگرتنیان بە رەونەقی جوانەوە دەبێ لەسەر کاغەزی ئەستور و بەشێوەی هونەریی بنەخشێنرێن، نموونەی ئەوانە بۆ ئاگادارکردنەوەکانی کتێبخانە تەرخان دەبن، وەکو: کاتەکانی خوێندنەوەی چیرۆك بۆ منداڵان، پێشانگا، لەگەڵ چالاکیی تر و دیاریکردنی رۆژانی پشوو.

**١٢-نمایش:**

نمایشەکان دەرفەتن بۆ کتێبخانە و بەهۆی بەرهەمی دامەزراوە نەتەوەیی و خۆجێیەتییەکانەوە کاریگەریی لەسەر بینەرە بەشدارەکان جێدەهێڵن، ئەوانە پارەیەکی باش بۆ کتێبخانە دەگێڕنەوە کە بەکەڵکی بودجەکەی و باشترکردنی خزمەتگوزارییەکانی دێت. ئەمە وێڕی ئەوەی بەهۆی ئەو نمایشەنەوە خەڵکێکی زۆرتر روو لە کتێبخانە دەکەن، بە تایبەت ئەگەر ریکلامیان بە شێوەیەکی پێویست و باش بۆ کرابێت، باشترین نمایشیش بۆ بینەرانی کتێبخانە نمایشە هونەرییەکانی منداڵانی قوتابخانەکانە، چونکە ئەوانە ئاسانن و سەرنج رادەکێشن و هاندەرن بۆ منداڵان و دایك و باوکیان تا سەردانی کتێبخانە بکەن.

ئەگەر لە کارمەندانی کتێبخانە کەسی هونەرمەندیان تیا نەبێت ئەوا دەتوانرێ لە کۆلیژی هونەرە جوانەکان هونەرمەند داوا بکرێت بۆ سەرپەرشتی چالاکییە هونەرییەکان، دەکرێ دواتریش ئەو نمایشە لە شوێنی تر و کتێبخانەی تر دووبارە بکرێنەوە.

پێویستە ئەو نمایشانەی لە کتێبخانەی گشتی دەخرێنە بەرچاو ناوەرۆکێکی نەتەوەییان هەبێت، هەروەها پەروەردەیی بن، تیایاندا کەرەستە روونکەرەوەکان و نیگار پانتایی باشیان پێ بدرێت، هەروەها تێکستەکانیان چڕوپڕ بێت، هەرچۆن پێویستە نمایشەکە تۆماربکرێت و وێنەی فۆتۆگرافیشی بگیرێت و لە ئەرشیفی کتێبخانەدا دابنرێت و سوود لێ وەربگیرێت.

**١٣-ئامرازەکانی راگەیاندن:**

ئاگاداریی راستەوخۆ لای کتێبخانەی گشتی پەسەندییەکی وای نییە، بێجگە لە ئاگادارییەکانی بۆنەکان لە رۆژنامەکانی ناوخۆ و پاشکۆی رێبەری تەلەفۆندا، بەڵکو دەبێ پێشوەختە دەبێ ئامادەکاریی بۆ بکرێت، ئەویش بە تێچووی دیاریکراو و نەخشەسازیی سادە و چاپ و دابەشکردنی گونجاوەوە، ئەم ریکلامانە دەبێ بە رستەی کورت و کاریگەر بنووسرێن، لەگەڵ رەنگ و دیزاینی سەرنج راکێش، بەڵام پۆستەر بۆ چاکی و بانگەشەی خزمەتگوزارییەکانی کتێبخانە دەبێ دیاریکراو بێ و لەگەڵێ شوێنی وەك قوتابخانە و کۆلیجەکان و کلینیك و مەڵبەندە تەندرووستییەکان هەڵبواسرێن، لەگەڵ هۆڵەکانی نمایش لە شارەکەداو یان وەرزشی و کۆمەڵایەتییەکان...

دەبێ ئەوانە لە پێناوی جوانترکردنی خزمەتگوزاریی کتێبخانەکاندا بن و بۆ هاندانی پشتیوانی کردن بێ لە کتێبخانەکان.

دەکرێ سوود لە کارمەندی پەیوەندییەکان لە کارگێڕیی خۆجێیەتی وەربگیرێن بۆ پەیوەندی کردن لەگەڵ رۆژنامە و رادیۆ و تەلەفزیۆن و ئامرازەکانی تری راگەیاندن، چونکە خودی ئەو کارمەندە پەیوەندیی بەردەوامی لەگەڵ ئەو کەناڵانەدا هەیە و دەتوانێ سوود بە بەرنامەکانی کتێبخانە بگەیێنێت.

بەڵام بۆ هەر بابەتێك کە لە راگەیاندنەکانــەوە پــەخش بکــرێ دەبــێ ئەمینــدار و کارمەندی شارەزای کتێبخانە ئاگاداری بن و بە تێکستەکەیدا بچنەوە.

هەروەها دەبــێ کارمەنــدی پەیوەندییــە گشــتییەکان لــە کتێبخانــە لــە دیــداری رۆژنامەنووسیدا بە باشی خزمەتگوزارییەکانی کتێبخانە بۆ خەڵکی باس بکات، هــەر خۆیشی کارمەندەکانی کتێبخانە رابهێنێت لەسەر ئاخــافتن و دیــداری رۆژنامــەوانی، دەبێ بۆ ئەو بۆنانە ئەمینداری کتێبخانــە خــۆی ئامــادە بکــات و لەوەبــەر کورتــەی قسەکانی بنووسێتەوە، هەروەها پێویستە ســەرجەم کارمەنــدی بەشــەکانی کتێبخانــە بتوانن گوزارشت لە ئەرك و چــالاکی و خزمــەتگوزاری بەشــەکانیان بکــەن، لــە هــەر دیدارێکی راگەیاندندا بێت، بەوەش کتێبخانە سوودمەند دەبێت و وێنەیــەکی رونــاکی دەکەوێتە بەرچاوی خەڵکی ئەو ناوچانەی کە کتێبخانەی گشتییان تێدایە.

# سەرچاوەکان

**بەزمانی عەرەبی**


١-حشمت قاسم، المكتبة العامة فى عالم متغير. ـ احوال المعرفة . ـ ١٩٤ (ينـاير ٢٠٠٠).

٢- محمد فتحي عبدالهادي، المكتبة المدرسية و دورها فى نظم التعليـم المعاصـرة،و حسن محمد عبدالشافي و حسن سيد شحاته.- الدار المصرية اللبنانية، ١٩٩٩

٣- حامد الشافعى دياب، المكتبات المتنقلة و دورها فـى نشـر الخدمات المكتبيـة: مجلة المكتبات و المعلومات العربية، ع ٤، ٢٠٠٠.

٤- قواعـد الفهرسـة الانجلـو- الامريكيـة، الطبعـة الثانيـة مراجعـة ١٩٨٨، مـع تعديلات ١٩٩٣/اعدت تحت اشراف لجنة التوجيه المشتركة لمراجعة القواعد مـن جمعية المكتبات الامريكية. تحرير ميشل جورمان، بول و . ونكلر، تعريب محمد فتحي عبدالهادي، نبيلة خليفة جمعة، يسرية عبدالحليم زايد.__ ط العربية ١.- القاهرة: الدار المصرية اللبنانية، ١٩٩٦.- ٢ مج.

٥- جورمان، ميشيل. موجز قواعد الفهرسة الانجلو- امريكية في طبعتها الثانية/ تعريب محمد فتحي عبدالهادي، نبيلة خليفة جمعة.- ط٣. القاهرة: الدار المصرية اللبنانية، ١٩٩٨.

٦- ديوي، ملفل. تصنيف ديوي العشري، الطبعة الثانية عشرة المختصرة/ تعريـب ادارة التوثيق والمعلومات بالمنظمة العربية للتربية والثقافة والعلوم، تحرير محمود احمد اتيم.-ط عربية٢.- تونس: المنظمة،١٩٧٧-٢ مج.

٧- اثرتون، بولين. مراكز المعلومات: تنظيمها وادارتها و خدماتها/ ترجمة حشمت قاسم- القاهره: دار غريب للطباعه والنشر والتوزيع، ١٩٩٦.

٨- احمد محمد الشامي. الموسوعة العربية لمصطلحات علوم المكتبات والمعلومات، انجليزي- عربي، القاهرة، ٢٠٠١.

٩- حسام الدين محمد رفعت. المكتبات العامة المحسبة في محافظتي القاهرة والجيرة ودورها في خدمة المستفيدين. القاهرة ١٩٩٩.

١٠- محمد امين البنهاوي. ادارة العاملين في المكتبات.- القاهرة: العربي للنشر والتوزيع،١٩٨٤.

**بەزمانی ئینگلیزی**

1- Soper Mary Ellen. The Librarian's Thesaurus /by Mary Ellen Soper, Laary N. Osborne, Douglas L. Zweizig.- Chicago: American Library Association, 1990-p. 5.

2- Usherwood, Bob. Public Libraries. P. 380 In International encyclopedia of information and Library Science.- London: Routlege, 1997.

3- Boyd, Alex. Public Libraries.- p. 676 In World ecyclopedia of Library and Information Services.- $3^{rd}$ ed.- Chicago:

4- Unesco Public Library Manifesto, prepared in cooperation with IFLA, 1995.

5- Office of Arts and Libraries. Setting objectives for public library servicess, Library and Information Series, no. 19,

HMSO, 1991. Thorhauge, Jens. A basic vision of the public Library in the information Society.- p. 9, 10, 12, 13. In: Public Libraries and the Information Society / by J. Thorhauge… [et al].- European Commission, 1997.

6- Stoalkey, Roger, Presenting the library Service.- london: Clive Bingley, 1982.- P. 41.

Bell, C.R. Men at work.- London: Allen and Unwin, 1974.- P. 25.

7- Tyckoson, David A. "Of the people, for the people: Public Library serve democracy".
American Libraries.- Vol. 31, Issue 4 (Apr. 2000).- P. 40.

8-White, Herbert S.A. "Authority, respencilibility, and delegation in public Libraries". Library Journal.- Vol. 124, Issue 15 (Sep. 15, 1999).- P. 59.

9-Lushington, Nolan. The design and evaluation of public library building.- humden, Connecticyt: Library professional publication, 199.- P. 58.

10-Broome, E. M. Do Developing countries need processing centers? Paper presented at the IFLA/ Unesco pre – session seminar for Librarians from developing countries.- Antwerp, August, 1977.

11-Stoalkey, Roger, Presenting the library Service.- london: Clive Bingley, 1982.- P. 73.

# بەرهەمە چاپکراوەکانی یاسین قادر بەرزنجی

## • زانستی کتێبخانەو زانیارییەکان:

١- بیبلیۆگرافیای هەردوو گۆڤاری نووسەری کوردو نووسەری کوردستان، بەهاوکاریی نەوزاد عەلی ئەحمەد، سلێمانی، ١٩٨٨.

٢- بیبلیۆگرافیای ٢٤ ژمارەی گۆڤاری سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.

٣- دەروازەیەك لەڕووی کتێبخانەو زانیارییەکان، سلێمانی،٢٠١٠.

٤- زانستی پێڕست و دۆکیۆمێنتاری، وەرگێڕان، سلێمانی، ٢٠١١.

٥- ئەو (١٠) کتێبەی جیهانیان هەژاند، ئامادەکردن، سلێمانی، ٢٠١١.

٦- چەند بابەتێك سەبارەت کتێبخانەو زانیارییەکان، هەولێر،٢٠١١.

٧- ئینتەرنێتو کتێبخانە، وەرگێڕان، سلێمانی، ٢٠١٢.

٨- پۆلێنی کتێب، وەرگێران:
چاپی یەکەم، هەولێر،٢٠١٢. چاپی دووەم، هەولێر،٢٠١٢.
چاپی سێیەم، هەولێر،٢٠١٣.

## • هونەری شانۆ:

٩- شۆرشی مردووەکان، شانۆنامەی وەرگێڕراو:
چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٠.
چاپی دووەم بە ناوی (مردووەکان بنێژن)، سلێمانی، ١٩٩٨.

١٠- پێنج وتاری شانۆیی، وەرگێڕان بەهاوکاریی چوار نووسەر، بەغدا، ١٩٨٠.

١١- لەئەرشیفی شانۆی کوردییەوە، سلێمانی، ٢٠٠١.

١٢-چەند بابەتێکی شانۆیی، وەرگێڕان، سلێمانی، ٢٠٠١.

١٣- ئەکتەرە کوردەکان، سلێمانی، ٢٠٠١.
١٤- دوای بیست ساڵ، چوار شانۆنامەی ئامادەکراو و وەرگێڕراو، سلێمانی، ٢٠٠١.
١٥- چەند باسێك دەربارەی شانۆی کوردی، سلێمانی، ٢٠٠٥.
١٦- شانۆی کوردی، ئەرشیف و تێکست.. نمایش و بینەر، سلێمانی، ٢٠٠٧.
١٧- چەند باسێکی شانۆیی، وەرگێڕان، هەولێر ٢٠٠٨.
١٨- فەرهەنگی شانۆ، بەرگی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٨.
١٩- لەئێوارەیەکدا، شەش شانۆنامەی پەك پەردەیی وەرگێڕراو، هەولێر، ٢٠٠٨.
٢٠- بەرەو ئەستێرەیەکی تر، شانۆنامەی بەکوردیکراو، سلێمانی، ٢٠٠٨.
٢١- هونەری دراماو رامانێك لەدرامای کوردی، سلێمانی ٢٠٠٩.
٢٢- ئەزموونە درەوشاوەکانی شانۆ، وەرگێڕان، سلێمانی، ٢٠١٠.

## • رۆژنامەوانی

٢٣- کێشەی کەمینە نەتەوەییەکان لەوڵاتانی عەرەبدا، وەرگێڕان، سلێمانی، ١٩٩٨.
٢٤- دروستبوونی دەوڵەتی کوردی، وەرگێڕان، سلێمانی، ١٩٩٨.
٢٥- مەرگی وەنەوشە، چیرۆکە هەواڵ:
چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.    چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.
چاپی سێیەم، سلێمانی، ٢٠١٠.    چاپی چوارەم، هەولێر، ٢٠١٢.
٢٦- کە ئاگر دەریای خامۆشکرد، بەرهەمی رۆژنامەنووسیی، سلێمانی، ٢٠٠١.
٢٧- چاوەکانی تابان، چیرۆکی رۆژنامەنووسیی:
چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.
چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٧.

٢٨- گەورەبوونی ڕۆح، بەرهەمی ڕۆژنامەنووسیی، سلێمانی، ٢٠١٠.
٢٩- ئیتیکی کاری ڕاگەیاندن و حەتمیەتی تەکنولوجیا، وەرگێڕان، سلێمانی، ٢٠١٠.
٣٠- ژین.. یەکەمین ڕۆژنامەی تایبەتمەندی ئەدەبیی، سلێمانی، ٢٠١٠.
٣١- بیرەوەرییەکانی مامۆستا خالید دلێر، ئامادەکردن، سلێمانی،٢٠١٢.

## • چیرۆکی منداڵان

٣٢- کۆچ بۆ دارستان، چیرۆکی منداڵانی وەرگێڕراو:
چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٨.
چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٨.
٣٣- قەفەزی زێڕین، چیرۆکی منداڵانی وەرگێڕراو:
چاپی یەکەم، سوید، ١٩٩٤.
چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.